لە مەرگەساتی کوردەوە



# کە ئاگر دەریای خامۆش کرد

یاسین قادر بەرزنجی

بەرهەمی رۆژنامەنووسیی

(٢)

لە مەرگەساتی کوردەوە

# کە ئاگر دەریای خامۆش کرد ..!

نووسینی

یاسین قادر بەرزنجی

سلێمانی ٢٠٠١

- کتێبی : کە ئاگر دەریای خامۆش کرد
- نووسینی : یاسین قادر بەرزنجی
- تایپ : ئیدریس شەیداهۆ
- مۆنتاژو جیاکردنەوەی ڕەنگ : شادمان ئیسماعیل
- نیگاری بەرگ : هونەرمەند بێگەرد عوسمان
- وێنە فۆتۆگرافییەکان : هونەرمەند فایەق حەمە ساڵح
- چاپخانەی : ڕوون
- تیراژ : ٥٠٠ دانە
- چاپی : یەکەم
- ژمارەی سپاردن : ( ١١٢) ساڵی ٢٠٠١ .

## دایە گیان ..

هەموو ساڵێ، لە یادی راپەڕینداو بەتایبەت رۆژی (٣/٧) یادگاری ئەو رۆژانەت دەگێڕایەوە کە شێرە پیاوانی کورد هەڵمەتیان بۆ سەر قەڵاکانی دوژمن دەبردو لەو رۆژەدا جگەر گۆشەیەکت لەگەڵ کورە ئازاکانی ژنانی تردا لە (ئەمنە سوورەکە) چاوەڕوانی ئازاد بوونیان دەکردو .. ئاواتت هاتەدی .

هەزار ئەفسووس، ئەمساڵ لەهەمان رۆژدا مەرگی تۆ ئەو یادە شیرینەی لێ تاڵ کردینو بۆ رۆژی دوایی (کە رێکەوتی ٨ ی مارسی رۆژی جیهانیی ژنان بوو) ئێمە لە پرسەی گەورەترین ژنی خێزانەکەماندا دانیشتین..

دایە گیان، دڵنیام یەکێك بووی لەژنە میهرەبانەکانی کۆمەڵی کوردەواریو بۆ گەورەکردنو پێگەیاندنی جگەرگۆشەکانت گەلێ ماندوو بوویتو لەیەك کاتدا دایكو باوکمان بوویت.

من جارێ تەنیا ئەم کتێبە شك دەبەم وەك چەپکێ گوڵ پێشکەشتی بکەم.. بەڵام تا دوا ساتی ژینم ئەمەکدارانە بەفرمێسك گڵکۆت تەڕ دەکەمو بە کرداری جوان رۆحیانەتی بێگەردت شاد دەکەم، یادت هەر زیندووبێت، دایکی بەڕێزم.

ی. ق. بەرزنجی

٢٠٠١/٣/١٤

## پەیڤێك ..

ئەوانەی بەهۆی کوردەوە تاڵاو چووە بەگەروویانداو لەپێناوی گەلدا دوژمنان ئازاریان داون یەکجار زۆرن، گەلی ئێمە بەدرێژایی تەمەنی ستەمدیدەبووە، لەهەر سەردەمو رۆژگارێکدا سەدان هەزار مەرگەسات لەرۆڵەکانی کورد قەوماوەو ئەمانەی بۆتانی دەگێڕینەوە بەشێکن لەهەزاران نموونەی ژیانو ئاکامی بەدبەختی، مەرگەساتنو زامێکی ئەوتۆن کەر هەرگیز سارێژبوونیان بۆ نییە.

---

**سەرنج :** بابەتەکانی نێو ئەم کتێبە لە رۆژنامەی ئازیزی (**کوردستانی نوێ**)دا بڵاوکراونەتەوە، لە دامێنی هەریەکەیاندا ئاماژە بە رۆژی بڵاوکردنەوەیان دراوە.

# کاتێ ڕۆڵەکانی گەرمیان
# بوونە میوانی بەرانان

**خالۆ تایەری گەرمیانی ..**

خالۆ تایەر ئەحمەد سەعدوللا، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٠) لەگوندی (حەفتا چەشمە)ی سەر بەناوچەی (جەبارە)ی کەرکوك، گوڵەکانی ڕۆژگاری لاوێتی خۆی لەبالآی تفەنگەکەی بەستو لەشۆڕشی کورددا هەڵۆیەکی ئەو گەرمیانەی دایکی هەڵۆیان بوو، لەدوای ساڵی ١٩٧٥ دەگەڕێتەوە شاری کەرکوکی خۆشەویستیو لەوێ بۆ دابینکردنی ژیانو لەپێناوی نان پەیداکردندا شان دەداتە بەر گەلێ کارو کاسبی .

خالۆی ڕەنجەڕۆی شاخو شار، خالۆی خاوێنو دڵسافو بێگەرد، لەسالآنی بالآدەستی ڕژێمدا هەر پیاوە دڵسۆزەکەی گەرمیان بوو، لەگەڵ

ژیانی نێو ماڵو منداڵیدا وەك ئاگری دەروونی بۆ کورد دەسووتا. کەبانگی
ڕاپەڕین لەچیاکانی کوردستانەوە درا، خاڵۆی شەستو یەك ساڵ وەك
هەڵۆکەی جاری جاران لوولەی تفەنگی نووسان بەنێو چاوانییەوەو بووە
بەشداریێکی گیان لەسەر دەستی ڕاپەڕین.. کەکەرکوکی هەمیشە داگیرکراو
لەلایەن رژێمەوە داگیرکرایەوە خاڵۆ تایەر چاوانی بەرایی نەهات بچێتەوە
ئەوێ، واز لەماڵو حاڵەکەی دێنێو بەنۆ سەر خێزانی گەورەو وردەوە
ڕوودەکاتە چەمچەماڵ، لەوێ ماوەیەك دەمێنێتەوەو ژیانی تاڵ لاپەڕەی
دیکە دەخاتە سەر ئەوانەی ڕابردووی.

**کۆڕەو .. شەڕی نێوان ژیانو مەرگ ..**

کەگەلی ئێمە بەجارێ ڕەوی کردو لوولەی ڕەشی تانكو تفەنگی دوژمن
ڕوویان کردە چەمچەماڵ، خاڵۆی خێرنەدیو بەخۆیو خێزانیەوە بەرەو
ناوچەکانی سلێمانی کەوتنەڕێ، خۆیو هەشت منداڵو کچێکی بەشوویو
دوو منداڵ، ژمارەیان (١٢)کەس بوون، دوانزەی بێ بەرگو بێنان، لەگەڵ
شەوی ساردی ڕەودا وەك زۆربەی خەڵکی هەزار بەپێ ڕێگایان دەبڕی،
لەشەوێکی ئەنگوستەچاودا، لەشەوێکی بەهاری ڕێژنەی بارانددا بەنێو
ڕێگای پڕ لەقوڕو چلپاودا، زریکەی منداڵی برسیو هاواری پڕ لەسۆزی
جەستە ماندووەکان ترسێکی بێوێنەیان دەخستە دڵی خاڵۆوە، خودایە
چی بکات، ئەو هەرگیز کۆڵی نەداوەو ئێستا هیچی لەدەست نایە! ئەگەری
هاتنی دوژمن بەڕێگای سەرەکیدا بڕیاری پێدەدات خۆیو جەرگەکانی ڕوو

بکەنە (بەرانان)، بەرانانی دایکی دڵسۆز، دەخیل بەڕێبوارانی مەنزڵ نادیار دێنەلات.. بەرانان دەبێتە هەواری شەو گوزەراندن..!

بەیانی زوو بەگیانی ماندوو و سکی برسییەوە هەنگاوە خاوەکانیان بەرەو گوندی (ئەڵڵایی) هەڵدێنن‌و، لەڕێگا بەخەڵکی روو لەڕەو دەگەن‌و ئاگاداریان دەکەنەوە کە(بازیان)و (ئەڵڵایی) لەلایەن رژێمەوە گیراونەتەوە، ئەوانیش بەبێ ئومێد روودەکەنەوە چیا.

## مەرگی منداڵ.. مەرگی ژیان! ..

شەوی دووەمی بەرانان لەشەوی یەکەم دژوارتربوو، بەردەوام دەباری، برسێتیو نەبوونی حەشارگەیەك بۆخۆی کارەساتێکەو لەوێنەی نییە، گریانی بەردەوامی منداڵ ئیقاعێکی ترسناکەو گەورەش لێی دەتۆقێ.. بەیانی زوو خاڵۆی ماندوو منداڵەکانی بەسەردەکاتەوە، یەکە یەکە بانگیان دەکا، سەرەتا لەسەرخۆ، پاشان بەدەنگی بەرز، سەیرە.. وەڵام نابیستێ، دەچێ بەلای ئەوانیترەوە، دەبینێ سەرما گرمۆڵەی کردوون.. دڵی خۆی دەداتەوە!

- ناحەقیان نییە برسێتیو سەرما نوزە لەگەرووی گەورەشدا ناهێڵێ..

ئەمجارەیان بەسەریاندا دەچێتەوە، لێیان نزیك دەبێتەوە، سەریان بەرز دەکاتەوە.. لەگەڵ هەڵڕشتنی فرمێسکەکانیدا هاوار دەکاتە ئەوانی دیکەو سەر بۆ لوتکەکانی بەرانان هەڵدەبڕێ:

- ئەی هاوار جەرگ سووتاو خۆم، ماڵوێران خۆم، ئەی هاوار شادانو شۆخان، ویداو ئەحلامم مردوون، خوای گەورە هەر خۆم زەلیلم..

منداڵەکانی تر بەڕەنگی نیوە مردووەوە دەڕواننە جەستەی داماوی جوانەمەرگەکانیان.. خاڵۆی جەرگ برژاو بۆ وەدەستهێنانی شقارتەو بەئومێدی ئاگرکردنەوەیەك، منداڵە زیندوو و مردووەکانی بەجێ دەهێڵێ.. پاش ماوەیەك کابرایەکی تووش دەبێ.. کەخاڵۆ خەمی خۆی بۆ هەڵدەڕێژێ، ئەویش بەڕەنگی پەڕیوەوە لەبزربوونی خێزانەکەی خۆی ئاگاداری دەکات! شقارتەی لێوەردەگرێو دەگەڕێتەوە..

کەدێتـەوەو بەلاشـەی شـەکەتەوە منداڵـەکان بەسـەردەکاتەوە، چـی دەبینێ؟ کارەساتە، کارەساتی کەم وێنەیە، دەبینـێ دوانـی تریان بوونەتـە قوربانی مەرگـو رۆحی سپییان بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە..

خـاڵۆ تـەنیا مردووەکـان دەبینـێ. مردووەکـان ژمارەیـان شەشـە، چ

کارەساتێکە؟ شەش جار جەرگ سووتان.. (ئەی ئەوانەی دیکە چییان لێهات؟).. خالۆ پاش ئەوەی (ئەمیرەو شنۆ) دەخاتە پاڵ چوارەکەی تر، بەدەوری خۆیدا چاوە بەقوڵاچووەکانی دەگێڕێو فرمێسك بەڕوومەتی ساردو ریشە سپییەکەیدا دێنە خوارێ، (خوای گەورە کوانێ سیروانی کوڕم، ئەی کوا کچەکەی ترم؟! ئەی کوانێ خوشکە گەورەکەیان و دوو کۆرپەکەی؟).. لەنێوان دوو پرسیاردا چۆك دادەدات:

- بەدیار تەرمی بێنازی شەش جگەر گۆشەوە بم؟

- یان بکەومە شوێن پێنجی تر؟!

**بەشوێن زیندووەکاندا ..**

خالۆ لەخۆی پرسی:

- ئاخۆ دانیشتن بەدیار مردووەوە باشترە، لەشوێن کەوتنی زیندووەکان؟

هەر خۆی لەگەڵ توندکردنەوەی جامانە تەڕەکەیدا بەخۆی گوت:

- نا.. نا، باشتر نییە، با شوێنیان کەوم.

ئەملا گەڕا .. ئەولا گەڕا.. بانگ و هاوار.. بێ سوودە.. دیاریان نییە..

خالۆ لەتاوا دەگریا.. کەفرمێسکی نەدەما چاوانی دەبڕییە ئاسمانی لێڵ و لەگەڵ ئەودا سکاڵای دەکرد.. لەناکاودا دەنگی هاواری ژنێك رایچڵەکاند.. هەنگاوی کردە دووان و سیان، بەرەو دەنگەکە هەڵکشا.. گەیشتە ئاستی ئەشکەوتەکەو کچە گەورەکەی خۆی بینی کەبەدیار ساوایەکی مردوویەوە دەگریا..

- خودایە بوون بەحەوت..

باشە کچەکەم، کوانێ سیروانو دوانەکەی تر؟

+ بابەگیان ئەوان واوە هاتنو منیش شوێنیان کەوتم، جێیان هێشتمو هاتمە ئەم ئەشکەوتەوە، لەباران خۆمان شاردەوەو ئەمیش لەباوەشمدا لاربووەوە.. گریاو قسەی تری بۆ نەکرا..!

## گەڕانەوە..

هەرچۆنێ بوو خاڵۆی ماندوو لەگەڵ کچەکەیو ساوای بێگیانیدا گەڕانەوە رووەو ئەللایی..

حەوت پەپوولەی بێگیانیان لەدوای خۆیان جێهێشت.. دەشێ بەئەمانەت بەبەرانانی سپاردبن.. گەیشتن، لەدەرگای ماڵێکیان دا، برانە ژووری، نانیان دەرخوارد درا، خزمەتیان کرا، دوای بەسەرهات گێڕانەوە خاوەن ماڵو میوانەکانی هەموو دایانە گریان.. دوای چەند ساتێ، هەموو پێکەوە چوونە بەرانان، دوای بڕینی رێگاو گەیشتنە حەوت نازداری بێناز، خاڵۆ تایەر سەری رووەو لوتکەیەکی بەرانان هەڵبڕی، وەك ئەوەی پێی بڵێ:

- سوپاس هاوڕێی دڵسۆز، وا هەموویان بەتۆ دەسپێرم، با میوانی تۆبن، میوانی هەمیشەیی تۆ بن.. دوای ماوەیەك گۆڕی بەکۆمەڵی جەرگەکانی بەجێهێشتو گەڕانەوە.

## چارەنووسی دوو منداڵەکەی تری چی بوو؟ ..

چوار ساڵ بەسەر کۆڕەوەکەدا تێپەڕی، هەموو ڕۆژێکی ئەو چوار ساڵە خاڵۆی دڵ پڕ لەخەم سۆراخی دووانەکەی تری دەکرد کەلێی ون بووبوون، سۆراخی (سیروان و نەجمە)ی کچی.. دوای شەوو ڕۆژە درێژەکانی ئەو چوار ساڵە، لەشەوێکی چاوەڕوان نەکراودا شاشەی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان (سیروان)ی نیشان دا.. خاڵۆ خەریك بوو لەهۆش خۆی بچێت.. بێژەرەکە گوتی:

- ئەم کوڕە دۆزراوەتەوە، بەڵام کەڕو لاڵە..

+ خوایە گیان بۆچ کەڕو لاڵە.. خۆ سیروانی دڵم دەنگی لەبولبول خۆشتر بوو.. خۆ سیروانی کوڕی تاقانەم بەنەرمە بانگ کردنێ، وەك ئاسکی وریا لەبەردەممدا قوت دەبووەوە..

خاڵۆ بەکوڕی کەڕو لاڵی شاد بووەوە.. پاش ماوەیەکی دیکە لەکەرکوکەوە هەواڵی دۆزینەوەی کچێکی کەڕو لاڵ بەخاڵۆ دەگات، دڵی دادەخورپێ، بەنەجمەی دەزانێ..

دەچێتە سۆراخی، بەڵێ خۆی بوو، نەجمە لەگەڵ ماڵێکی خێرەومەنددا دەژیا.. هێنایەوە..

زۆر شتیان سەبارەت بەکەڕو لاڵ بوونی نەجمەو سیروان بۆ خاڵۆ باس کردووە، تەنانەت پرسیاری پزیشکێکیشی کردووە، بەڵام ئێستاش نازانێو نازانێ.. نازانێ بەچی وایان لێهات، زۆر جار بیردەکاتەوەو دەڵێ:

- وەڵێ کەبەدبەختم، لەهەشت منالی جوان تەنیا خاوەنی کچو کوڕێکی کەڕو لاڵم.. خودایە شکورم بەبەشی تۆ..

★ ★ ★

کوردستانی نوێ

١٩٩٥/١٠/٢٥

---

★ سەرچاوەی نووسینی ئەم بابەتە زانیارییەکانی برای رۆژنامەنووسم (برایم محێدین عارف)ن کەلەزاری خاڵۆ تایەرەوە تۆماری کردوون.

# که ئاگر دەریای خامۆش کرد .!

لەگۆڕستانی (شێخ محێدین)ی سلێمانی.. لەنێوان هەزاران جەستەی ڕاکشاودا.. لەنێوان ئەو هەموو شەهیدو جوانەمەرگو حەسرەت دیدەو پیرەمێردو پیرەژنە نورانییەو، لەنێوان کۆرپەو ساواو منداڵاندا کە لەگەڵ داخستنی چاواندا هەرزوو بوونەتە (چۆلەکەی بەهەشت).. لەنێو گۆڕی سەدان دڵدارو بەموراد نەگەیشتوو.. لەنێو سەدان هەژارو ماندوودا کە هەمیشە نانێکی گەرمیان لێ دەبووە مانگی سوور.. لەنێوان ئەو مرۆڤە هەناسەساردانەی هەر لەبەر ئەوەی (ئافرەت)بوون بەملکەچی ژیانو بەبێ نازی مردنو ڕازو قسەی دڵیان بردە ژێرگڵەوە ..

لەنێوان هەموو ئەو گۆڕانەدا، بۆ سێ ساڵو نیو دەچێ جەستەی ئاگر تێبەربووی دوو مرۆڤی دیکە بوونەتە میوانی شێخ محێدینو هەموو ڕۆژانی هەینییەك، کەسوکار دەبنە میوانیانو دوای ناردنی درووود بۆ گیانی پاكو خاوێنیان؛ فرمێسك دەڕژێننە سەر گڵکۆیان..

ئەوان بەمەرگی شاد بوون کە هەرگیز چاوەڕوانی نەبوونو.. ئەمانیش بەمەرگی ئەوان ئاگر بەربووەتە دڵو دەروونیانو بۆ سێ ساڵو نیو دەچێ ئەو ئاگرە نێڵە نێڵێتیو هەرگیز خامۆش نابێ..

ئەوان رۆیشتنو دوو گۆڕیان لێجێما، یەکێ بچووكو یەکێ گەورە.. ڕۆیشتنو بوونە بەشێك لەمەرگەساتی گەلی خۆیانو بوونە چەمێکی بەخوڕو ڕژانە نێو ڕووباری نەسرەوتی خوێنی شەهیدان..

ئەمانیش دوو پەیکەریان لەبیرو دەرووندا بۆ تاشینو هەمیشە کڕنووشیان بۆ دەبەنو لەئاستیاندا ڕاوەستاونو جێیان ناهێڵن..

ئەوان دوو درەختی سەوزن، یەکێ بالآبەرزو پڕ لقو پۆپ وەك درەختی بەدیمەنی بەر ماڵە هەژاران، یەکێ هێشتا نەمامی ساوایەو لەسایەو سێبەری درەختە گەورەکەدایە..

ئەوان دوو گیانی زیندووی نێو باخچەکانی بەهەشتن....

ئەمانیش هەمیشە لەگەڵ یادگارەکانی ئەواندا دەژین.

* * *

**لە پێناوی ڕۆشنایی چاوەکانیدا..**

ناوەڕاستی ئابی ١٩٩٥، حاجی حەپسەی پیرەژنی ئیماندارو خۆشەویستی هەموو لایەكو سەرچاوەی سۆزو ڕێزی خێزانەکەی، کوڕەکانی ئاگادار کرد کە بڕیاری داوە بۆ نەشتەرگەریی چاوە کزەکانی بچێتە بەغدا..

کوڕە ناوەنجییەکەی وتی:

- دایەگیان دنیاگەرمەو ماندوو دەبیت، بۆ کەمێ دوای ناخەیت؟

ئەویش وەڵامی دایەوە:

- نا کوڕم بازەلیل نەبم .. ئینسان کەچاوی دانا مەرگی باشترە..

کوڕی گەورە وتی:
- باشە خۆم دێم لەگەڵتا..
وەڵامی دایەوە:
- نا بەقوربانت بم، ماڵو منداڵی خۆت جێ مەهێڵە.. من (دەریا)م بەسە لەگەڵم بێ.. خەمت نەبێ، لەوێش دەچمە ماڵی خوشکەکەتو ئەو نایەڵێت لەهیچم کەم بێ..

ئینجا کوڕە بچووکەکەی وتی:

- ئاخر دایەگیان دەریا چی پێدەکرێ.. بۆ نازانی ڕێگا چەندە ناخۆشەو حکومەت لەکەرکوکەوە چی بیانوو دەگرنو چۆن ڕێگای خەڵك دەدەن.. بۆ نازانی خەڵك بەچی دەگەنە کەرکوك؟ دایەگیان بالەبری دەریا من بێم لەگەڵت..

دەستی خستە سەرشانی کوڕە بچووکەکەیو بەدەم پێکەنینەوە وتی:

- بەساقەت بم، مـن و دەریـا بـەڵێنمان داوە هەمیشـە پێکـەوە بـین.. هەمیشە پێکەوە بژین.. تەنانەت پێکیشەوە بمرین..

کوڕەکانی رازی کـرد.. ئـەوانیش خـەرجی سـەفەریان بـۆ ئامـادە کـردو یەك لەدوای یـەك دەستە پیرۆزەکانی حـاجی حەپسـەیان مـاچ کـرد..بـەر لەوەی جێی بهێڵن چاو ودڵیان تـێبڕی.. کـە جێشیان هێشت هەرسێکیان دڵی خۆیانیان لا دانا..

هـەقیان بـوو.. وردو درشـتی حـاجی و ژیـانی پـڕ لەمەینـەتی و رەنجـی دوورو درێژی ئەو دایکەیان دەزانی و لەبەرچاو بوو، ئەو دایکەی بەبێوەژن کۆشـی بـەخێوی‌کردن و خۆیـان و سـێ خوشـکیانی گـەورە کـردو کردنیـە مرۆڤی ئەوتۆ کە خۆی و کەسوکاری شانازییان پێوە دەکردن..

شەو داهات، دەریـا وەك هـەموو شـەوانی تـر چـووەوە باخـەڵی گـەرمی دایکە حاجییەوەو بەدەم باسی بەغداو چوونە بازاڕو چوونە زیارەتی شێخ عەبدولقادرەوە خەونـی شـیرین لـەچاوە گەشـەکانی‌کەوت.. بـۆ بـەیانی کـە ٢٠ی ئاب بوو، بەڕێ کەوتن...

★ ★ ★

## عومرێکی پڕ لەحەسرەت...

حـاجی حەپسـەی تەمـەن(٧٥)سـاڵ، زۆربـەی ژیـانی بەکولەمـەرگی و کوێـرەوەری بەسـەر بردبـوو، کاتـێ لـە(کـانی ئاسـکان)لـەدایك بـووە بـاوکی بەهاتوچۆی نێوان شارەکەی و ئێران نانی پەیدا کردووە.. زۆر مندالّ بووە کە باوکی بەکارەساتێکی دڵتەزێن کوژراوەو کۆتایی بەژیانی هاتووە.. ئیدی

لەگەڵ تاڵی رۆژگاردا گەورە بووەو هەژاریو نەبوونی بەباڵای تەمەنی براوە..

کەشووی کردووە دووبارە هەژاری دووچاری مەینەتییەکانی ژیانی کردووە.. خوا شەش منداڵی پێداوە.. بەر لەساڵی ٧٠مێردەکەی فرمانی یەزدان بەجێدێنێو ئیدی بووەتە دایكو باوکی منداڵەکانی..

ئەم خانمە، زۆرجوامێرانە رەنج دەداتو منداڵ گەورە دەکات، ساڵی(٧٤)خۆیو کۆرپەکانی دەچنە ژێر سێبەری شۆڕشو لەوێوە بەرەو ئێران... کە دەگەڕێنەوە خانوویەکی قوڕی دوو ژووری دەبێتە مەنزڵو پەناگەیان.. زۆر شەو خۆیو منداڵەکانی بەنانی وشك رۆژ دەکەنەوە.. بەدروومانو نانکەریی ماڵان؛ خێزان دەبات بەڕێوەو کۆڵ نادات..

هاوسێو دەستە خوشکەکانی بەبینینو گفتوگۆی ئەو ژنە کارامەیە گەلێ ساتی رۆژگارو شەوگار دەبەنە سەر..

لەخۆشی وناخۆشی هەمووواندا بەشدار بووەو لەحەفتاکانو هەشتاکاندا خەونێکی دێرینی دێنێتە دی ؛ کە سەردانی حەج بووە.. لەرەمەزانو شەوانی هەینیو جەژنەکاندا حاجی سەردانی کاك ئەحمەدی شێخی کردووەو لەوێ بەدڵی گەرمەوە پاڕاوەتەوە منداڵەکانی سەلامەت بنو کوڕی خەڵکی نەبنە قۆچی قوربانی..

* * *

**ئەو منداڵەی بووە کچە بچکۆلانەکەی..**

ساڵی (٨٩)، کاتێ حاجی لەگەڵ چەند دراوسێیەکیدا بەلای مزگەوتی گەورەدا رەت دەبن، ژنێکی عەبا بەسەر منداڵێکی ساوای شیرەخۆرە لەژێر عەباکەی دەردێنێو روو دەکاتە ژنەکان:

- بەقوربانتان بم، کارێکی بەپەلەم هەیەو ئەم منداڵەم بۆ بگرن، هەر ئێستا دێمەوە لاتان..

چاوەڕوانی وەڵام ناکاتو دەیداتە دەست یەکێکیانو بەرەو خوار تێکەڵ بەئاپورەی خەڵکەکە دەبێو لەچاویان ون دەبێ.. منداڵە یەك مانگەکە دەداتە گریانو .. یەك لەژنەکان دەڵێت:

- ئەیەڕۆ ئەو ژنە چیکرد.. بۆ کوێ چوو؟

یەکێکی تریان دەڵێ:

- باشە بۆ لێت وەرگرت..

حاجی دەڵێ:

- قەینا دایکەکەم.. با چاوەڕێی بین.. بزانین مەسەلە چییە؟..

ماوەیەکی باش لەو جێگایەدا دەوەستنو ژنە ناگەڕێتەوە.. هەموو غەم دایاندەگری..

یەکێکیان دەڵێ:

- کچێ چی لێ بکەین..

هەموو دۆش دادەمێنن.. حاجی لەهاتنەوەی ژنەی خاوەن منداڵ هیوا بڕاو دەبێ.. لەسەرخۆ دەڵێ:

- چی بکەین، کاری خوایە.. دەبێ یەکێکمان بیگرینە خۆ..

ژنەکان یەك لەدوای یەك وەڵامی دەدەنەوە:

- ئەی قوڕ بەسەرم، بۆمن ئەوانەی خۆم جوان بۆ بەخێو دەکرێ ئەمیشیان بچێتەسەر..

- بەخوا باشە، وەڵاهی مێردەکەم بەمنداڵەکەوە دەمکاتە دەرەوە..

- هەر خوا دەزانێ چۆن لەدایك بووەو کچی کێیە.. بابیبەین بۆ خەستەخانە..

حاجی سەرپۆشەکەی توند دەکاتەوەو عەباکەی دەداتەوە بەسەرداو بەهەموویان دەڵێ:

- سەری دنیا بەپووش نەگیراوە.. قەیناکا، خۆم دەیبەمەوە.. کێ دڵی دێ ئەم گوڵە بێکەس بێ.. بەخوا دایکم لەئێستاوە رەحمم چووەتە سەری‌و دەیکەم بەمنداڵی خۆم..

توند دەینێ بەسنگییەوەو بەرەو ماڵ دەیباتەوە.. حاجی، هەرزوو منداڵە بچکۆلەکەی لەدڵدا شیرین بوو.. وەك گوڵ بەخێوی کرد.. ناوی نا(دەریا).. کە دیارنەمایە عەوداڵی دەبوو.. نەیدەهێشت هەرگیز لێی دوور بێ‌و باشترین خواردنی دەدایەو جوانترین جلی بۆ دەکرد..

دەریا بووە خۆشەویستی هەمووان.. بووە هاوڕێی کچەزاو کوڕەزاکانی حاجی حەپسە.. ئەویش بەدەستە بچووکەکانی ئاوی دەهێنا بۆ دایەو سەرو قژە زەردە جوانەکەی دەخستەسەر رانی دایەو بەدەنگە ناسکەکەی قسەی دەکرد بۆ دایە..

دەریا بەڕەسمی بووە کچی دایکی خۆی‌و شەوانە لەگەڵ حەکایەتدا دەستی دەکردە ملی خەوێکی قووڵ‌و شیرین..

* * *

## گەڕانەوە بەئوتومبێلی مەرگ.. !

دوای ئەوەی حاجی حەپسە لەبەغدا نەشتەرگەریی چاوی بۆ کراو پانزە رۆژ لەوێ مانەوە، رۆژی ١٩٩٥/٩/٨هاتنەوە کەرکوك‌و، لەوێ غەمی گەڕانەوە بەرەو سلێمانی دایگرت..

نەیدەهێشت (دەریا) هەست بەماندوێتی خۆی‌و ترسی چۆنێتی گەڕانەوەیان بکات..

نێـوەڕۆ بـوو، دوای نـان خـواردن لای (حەسیرەكان)خـوا شـۆفێری ئوتومبێلێكـی لۆری بۆ ناردن..

لەگـەڵیا ڕێككـەوت كـە بیانهێنێتـەوە بۆسـلێمانی.. ئەویش وتی:

- باشـە، لـێرە چاوەڕێم بـن، دەچـم هـەندێ نـەوتو بـەنزین دەكڕمو دێمەوە بۆلاتان..

حـاجی بیسـتبووی‌و ئاگاداربوو كـە ماوەیەكـە ڕژێـم ناهێڵێ سـووتەمەنی بگاتـە لای خۆمـان، هـەر بۆیـە بەدەببـەو جەلیكانە خەڵكی‌و شـۆفێرەكان نەوتو بەنزین دەردەكەن..

كـەمێ دڵی داخورپـا.. ئـەو تـەنیا بـیری لای ئـەوە بـوو لەبازگەكـە ڕێگایـان نـەدەن‌و بـەهۆی نـەوتو بەنزینـەوە دوابكـەون.. دەریـا سـەرنجی دایكی‌دا.. هەربۆیە لێی پرسی:

- دایـــه، ئـــەوە بـــۆ وا
بێتاقەتی..
وەڵامی دایەوە:
- هیـــچ نیـــیە بـــەقوربانت
بم.. هیچ نییە..
ئینجا وتی:
- ئـــەی دایـــە کـــەی
دەڕۆینەوە؟
وەڵامی دایەوە:
- دەڕۆینــــــــــــــــەوە
عەمرەکەیدایـە.. تۆزێکـی تـر
دەڕۆینەوە..
پاش ماوەیـەك چاوەڕوانی،
لۆرییەکــــــە گەڕایـــــەوە..
شـۆفێرەکە بـانگی لێ کـردن و
ئـەمانیش سـەرکەوتن.. بـەرەو
بازگەی مەرگ کەوتنە ڕێ..
حـاجی دەسـتێکی لەسـەر
پـەڕۆی سـەرچاوە عەمـەلیات
کراوەکـەی و دەسـتێکی لـەملی
دەریادا بوو..

سەرنجیان دا ریزێکی دوورو درێژ لەئوتومبێل وەستاون..

- خودایە، کەی نەجاتمان بێ..

شۆفێرەکە وتی:

- خەمت نەبێ دایەگیان.. ئەم درندانە رۆژانە ئەم بەزمەمان پێ دەکەنو بەبیانوو و قسەی ناخۆشەوە بەرێمان دەخەن..

سەرەیان هاتە سەر، دوو کلاو سوور کەوتنە پشکنینی لۆرییەکە..

سەرکەوتنە سەری، بەبینینی نەوتو بەنزین شێتگیر بوون.. پەلاماریان دانو دەستیان کرد بە فرێدانیان بۆ خوارەوەو بەقلَپ کردنەوەیان بەناو پشتی لۆرییەکەدا..

لەپڕ ئاگر کەوتەوە ، ئاگر کلَپەی سەند.. ئوتومبێلەکە گرتیو بەپەلە کابرای شۆفێر خۆی فڕێدایە خوارەوە..

دەنگە دەنگو هاواری سەربازەکانی بازگەو هاواری شۆفێرو خەلَکی ترو دەنگی لێخوڕینی بەپەلەی ئوتومبێلەکان تێکەلَ بوون..

هەموو لەئاگر دوور دەکەوتنەوە، دەریاو دایکی نەبێ بەواق وڕماویو ترسەوە دەیانڕوانییە ئاگری بێ رەحم..

دەریا چووە باوەشی دایکییەوەو توند توند خۆی پێوەنووسان..

ئاگر بەربووە جەستەیان.. جلو پێستو قژو گۆشتیان بووە خۆراکی ئاگری سوورو ئەوانیش هێدی هێدی وەك مۆم دەتوانەوە..

کە ئاگرەکە خامۆش بوو.. دوو مرۆڤی سوتاو بینرانەوە، دایكو کچێ کەهێندە دەستیان لەملی یەکتر کردبوو، بوو بوونە یەك جەستە..

* * *

**ئه مجارەیان باوەشت زۆر گەرمە..**

چل رۆژ دوای کۆچکردنیان.. یان شەهید بوونیان، بارانێکی کەمی ناوەڕاستی تشرین گلکۆی دایكو کچی تەڕ دەکرد..

ماوەی چل رۆژ بوو رۆحیانەتی بێگەردی دایكو کچ لەگۆڕستانەکەی شێخ محێدین ئارامیان گرتبوو..

ژنانی گۆڕستان لەدەوری (حاجی) کۆ دەبوونەوەو ئەمیش بەسەر هاتی ژیانی پڕ لەحەسرەتی خۆی بۆ دەگێڕانەوە.. چل رۆژ بوو دایکی سووتاو، شالاوی ئاگری بێ بەزەیی بازگەکەی کەرکوکی بۆ باس دەکردن..

چل رۆژیش بوو مندالانی نێو دلی ئەو گردە (دەریا)یان جێنەدەهێشتو سەرنجی پرچی خاو و چاوە گەشەکانیان دەدا..

بەلام دەریا نەیدەزانی باسی ئاگر تێبەربوونی خۆیان بۆ بکات.. بیری نەبوو چۆن چۆنی مردووە..

تەنیا دەیوت (من لەباوەشی دایکی خۆمدا بووم وهەر لەگەلْ ئەویشدا هاتم بۆ ئێرە)..

چلەی ماتەمی دایكو کچ بوو.. کوڕانو کچانو کەسوکارو دراوسێکانی حاجی حەپسە هەموو لەوێ بوون..

لەسەر گۆڕی حاجی نووسرابوو (سالی ۱۹۲۰لەدایك بووەو سالی۱۹۹۵بەمەرگەساتێ شەهید بووە)..

لەسەر گۆڕە بچووکەکەی دەریاش نووسرابوو (چۆلەکەی بەهەشت)، یەك لەئامادەبووان وتارێکی خوێندەوە، تیایدا وتی:

- ئەوە چییە دایە، ئەمجارەیان باوەشت زۆر گەرمە..

- ئەی چۆن کۆرپەم، ئەمجارەیان گەرمی باوەشێکی نەبڕاوەیە، لەئامێزی یەکدا دەبین، بۆ ئەو دنیاش هەرپێکەوە دەبین.. ئەی ئێمە هەمیشە دۆعامان نەدەکرد کە هەر پێکەوە بین و پێکەوە بین..

١٩٩٩/٢/١٦

# له دوا شەوی ژینیدا :
# با گۆرانییەکەی جاران بڵێینەوە

رۆژی ١١/١٢/١٩٨٠ هەواڵێك وەك بروسکە خۆی کرد بەشارە غەمبارەکەی سلێمانیدا، هەواڵ وتی(ئەمشەو دوابینیی ئەکرەمەو ئیدی لەسێدارە دەدرێ..).

هەرلەو ساتەوە شەقامی گۆران بەخامۆشی پرسەی بۆ دانا.. دراوسێکان چوونە لای باجی حەپسە.. ویستیان دڵنەوایی بدەنەوەو کەمێ ئارامیپێببەخشن. بەڵام سوودی نەبوو، هەنسکی گریان لێی نەدەگەڕاو بەخوڕ فرمێسك لەچاوانی دەبارین، بەدراوسێ دڵسۆزەکانی وت:

-بەوخودایە لەو رۆژەوەی گیراوە دەمزانیئەمەچارەنووسی دەبێ و دەیکوژن ٠٠ دەمزانی دوژمن لەکوڕی من دەترسێو داخ لەدڵن لێی، دەستیان بشکێ، چاویان کوێربێ، روویان لەبەردەم مەحشەردا رەش بێ.. هەڵبەت دەزانن، ئێوەش دەزانن کوڕی من چۆن کوڕێ بوو.. هەرگیز کون لەجەرگیا نەبوو، لەوەتەی خۆی ناسیووە بۆ هەژاران‌و بۆ گەلی خۆی دەژی..

کوڕە گەورەکەی بەپەلە خۆی کرد بەماڵدا.. ویستی شتێ بڵێ‌و دایکی ئازار چەشتوو بواری نەدا:

-دەستم بشکێ‌و چاوم کوێر بێ.. محەمەد گیان، دواسەردانی ئەکرەمە.. دەك لاڵ بم بۆ پشتی شکاوی تۆ.. دەك بمرم بۆ ماڵی بێ برای تۆ..

وەستا محەمەد وشە لەگەروویدا خنکان‌و هیچی بۆ نەوترا.. فرمێسك چاوەکانی‌تەڕ کردو (رۆزا)ی کچە بچکۆلەکەی برا زیندانییەکەی لەئامێز گرت‌و سەری‌بەسەردا شۆڕ کردەوە...

یەك لەدراوسێکان وتی:

-بەقوربانتان بم، دان بەخۆتاندا بگرن، هەر خوا خۆی گەورەیە، کێ دەڵێ ئەو هەواڵە راستە... محەمەد گیان لەدەورت گەڕێم، کێ ناڵێ حوکمەکەی نەگۆڕاوە، ئەی وا ناڵێن، ناڵێن فەلەستینیەکانیش واستەیان بۆ کردووە؟!

-نا پورێ گیان، ئەوان لەئەکرەم ناگەڕێن.. دڵنیام دەیکوژن، نامەردن‌و هەر ئەمشەو دەیکوژن..

ژنە خێر لەخۆنەدیوەکەی ئەکرەم بەرەنگی پەرپیوەوە هات و دەستە بچکۆلەکانی(سەنگەر)ی تەمەن دووساڵی گرتبوو، رووی کردە خەسووی‌و وتی:

-باجی حەپسە ئێمە ئامادەین..

بەهەر حاڵێ بوو باوکە پەك کەوتەکەی ئەکرەمیان خستە نێوپاسەکەوەولەبەر ماڵ جوولان، کات خەریك بوو نیوەڕۆ جێبهێڵێ.. هەموو بەرەنگی زەردو دڵی گەرمەوە بەرەو موسڵ بەڕێ کەوتن..

**ئەکرەم لەبیرەوەری هاوڕێکانیدا..**

هەر ئەو رۆژە، هاوڕێ نزیکەکانی بڕیاریاندا بەرەو دوادیدەنی ئەکرەم بگەنە موسڵ.. کەلەبازگەی تاسلۆجە رەت بوون قسە دامەزرا، باس هەر باسی ئەو بوو ، قسە هەر لەسەر ئازایەتیو رەوشت بەرزیو سادەو ساکاریی ئەو بوو، نموونە هەر لەسەر روناکبیری و وەفاداری ئەو بوو. ئەحمەدی حەمکوڵ وتی:

- خوا ئاگای لێیە چوار مانگە، لەوەتەی گیراوەو براوەتە هەیئەی کەرکوك من هەر چاوەڕوانی ئەم هەواڵە ناخۆشە بووم... کەبرایە موسڵ

زانیم بۆ لەسێدارەدانە.. بەڕاست، ئەزانم سـەنگەری کـوڕی دووسـاڵە، ئـەی کچەکەی چەندە؟

سەروەری فەتاحی سەمەن وەڵامی دایەوە:

-بەد بەختـە چـوار مانگـە، لەوەتـەی هاتۆتـە ژیانـەوە بـاوکی خراوەتـە زیندانەوە..

هونەرمەند حەمەی نێرگز دۆستی گیانی بەگیانیی ئەکرەم، بەشداریی قسەی کردنو وتی:

-لـەزووەوە دەیناسـم، کوڕێکـی بـێ وێنـەبوو، لەمنداڵییـەوە خەریکـەو یەك ڕۆژ ورەی بەرزی نەوی نەبوو.. بـەحوکمی خـاڵۆزاو پوورزایـی لەگـەڵ کـاك مسـتەفا چاوڕەشـدا بەیەکـەوە ژیـاونو هەربەیەکیشـەوە گـەورە بـوون..ئـەو هەرلەسـەردەمی قوتابیـانی گشـتیـیەوە هـەر چەپو مارکسـی بووە.. دەزانن هەرلەسەرکاك مستەفاو یەکێتی گیراو ئازار دراو حوکمیش درا..

کاك جەزا وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ وایە، نامەکەی ئەکرەمیان تەسلیم بەئەمن کرد.. ئیتر لەسەری بووە بەڵگەو مایەی بڕیاری لەسێدارەدانی..

حەمە وتی:

-ئەحمەد گیان، لەبیرتە ، لەبیرتە کەدەچووینە دەشت هەمووجار حەزی دەکرد گۆرانی(دەمەگری..مەگری)بڵێین..

ئەحمەد وتی:

-بەداخەوە، کوڕی وا دروست نابێتەوە. بەداخەوە..

**ژیانێکی پڕ لەخەباتو تێکۆشان..**

ئـەکرەم سـاڵی ١٩٤٥لەبنەماڵەیـەکی هـەژارو زەحمەتکێشی گـەڕەکی سابونکەران لەدایك بوو بوو، کەگەیشتە قۆناغی ناوەندی وێڕای وانـەکانی قوتابخانـە هەمیشـە پەرۆشـی خوێندنـەوەی بابـەتی ئـەدەبیاتو کتێبـی سیاسی بووە.. لەئامادەییدا بۆ هاوکاریی باوکـە کرێکارەکـەی، هاوینـان بـە بۆیاخچێتیو کرێکاری خۆی خەریك دەکرد..

کەچۆتە ناو ڕێکخستن لەگەڵ هەریەك لەوەستا محەمەدی برا گەورەی و نەسرین خانی خوشکیو مستەفا چاوڕەشی خاڵۆزای کاری ڕێکخراوەیی کردوەو ئەوان ئاگاداری جموجۆڵی بوون..

لەریزی شانە ئاگرینەکانی (قیادەی مەرکەزی)دا هەڵمەتی شێر ئاسای بردووەو گەلێك زەبری کوشندەی بەدوژمن گەیاندوە..

لە٦٨دا بۆ کاریڕێکخراوەیی براوەتە بەغداو لەگەڵ هاوڕێ بوێرەکانیدا گەلێ کاری پڕ لە جوامێریو گەلێ داستانی ئازایەتییان تۆمار کردووە.

ماوەیـەك لـەریزی بـەرەی میللـی رزگـاریخوازی فەلەسـتیندا خـەباتی کـردوە.. لـە٧٨دا خـێزانی پێکـەوە نـاوەو هـەموو مەبەسـتێکی ئـەوەبوو منداڵـەکانی بـەرێگای راسـتدا بـڕۆنو بـەبیرباوەڕی شۆرشـگێڕانەو مرۆڤدۆستانە پەروەردەیان بکات..

لەنیوەشـەوێکی مـانگی ئـابی١٩٨٠دا مـلازم موحسـینو چـەکدارەکانی، گـەڕەك و سـەربانی مـاڵی ئـەکرەمی وەسـتا حەمـە ئـەمین ناسـراو بـە (ئەکرەمی حەپسـە) یـان گـرتو دەسـتگیریان کـردو بـەرەو ئـازارو لێـدانو هەڵواسین برا..

هەرچۆن مەزنە مرۆڤانیکورد لەزینداندا باوەڕو ورەی بەرزیان کێو ئاسا دەمێنێتەوە، ئەکرەمیش یەکێك بووە لەو قارەمانانە کەبەرگەی هەموو جۆرە ئازارێکی گرتووە..

مامۆستا مەحمود رەشید قەرەداغی یەکێکە لەهاوڕێکانی زیندانی ئەکرەمو سەبارەت پاڵەوانێتی ئەو کوڕە هەڵکەوتووە باسی کردو وتی:

-چەند مانگێك شەهیدیان هەڵواسیو هەموو جۆرە ئەشکەنجە دانێکیان لەگەڵدا تاقیکردەوەو بێ سوود بوو، لەنێوان ئەمنی سلێمانیو هەیئەی کەرکوکدا بەدەست ئازایەتی ئەوەوە دامابوون، یەك وشەیان لێ هەڵنەکڕاند، بەڵام دواجار بەهۆی دڵپاکی خۆیەوە هەندێ لەنهێنییەکانی ژیانو خەباتی لای گەنجێکی هەڵخەڵەتاوی سەربە ئیدارەی هەیئە درکاند بوو، ئەویش گەیاندبووی و ئەوە بووە بەلگەو بڕیاری لەسێدارەدانی..بەڕاستی هەموو زیندانییەکان پەرۆش بوون بۆ ئەو قارەمانە.

هەروەها کاك نەژاد حەمە باقی لەزیندانی هەیئەدا ماوەیەك لەگەڵ ئەو تێکۆشەرەدا بووە، ئێستاش یادگارە شیرینەکانو ئازایەتیو زەردەخەنەی سەر لێوی شەهید دەگێڕێتەوە..

## لە پێشوازی میوانەکانیدا..

سەر لەئێوارەی١٢/١٠بەچاوی تەڕەوە دایكو باوك وژنو منداڵو خوشكو براو کەسوکاری نزیکی ئەکرەم لەبەر زیندانەکەی موسڵدا بوون..

بروسکەی ئەکرەم کەداوا لەکەسوکاری دەکات دوا دیدەنی بکەن نیشاندراو برانە ژورەوە..

ڕێنمایی کران ، کەبەئسوولی دەیبینن‌و هیچ ئاژاوەیەك نابێ ڕوودات. بەدووکەس باوکی ماندوویان گەیاندە ژوورەوە..

شەوی مەرگی ئەکرەم داهات.. هەموو بەدیداری گەیشتن، ئەکرەم هەر کوڕە ئازاکەی جاران بوو..

زەردەخەنەی سەرلێوی هەر زەردەخەنە جوانەکەی جاران بوو.. وتەو گوفتار هەر وتەی زمانە شیرینەکەی جاران بوو...

تێر تێر هەردوو جگەر گۆشەکەی ماچکرد، کوڕەکەی لەباوەش گرت‌و کچەکەی نایە سەر شانی.

بەدایکی وت:

-دایە گیان، غەمت نەبێ، ئەهادوو مندالی جوانت بۆ جێ دێلم. غەمت نەبێ دایە گیان، ئەی تۆ بۆ ئەم ڕۆژەت گەورە نەکردم..

ئینجا بەکاکی وت:

-بەسەر بەرزیت دەسپێرم، کاکە گیان سەرت بەرزە برایەکی شەهیدت دەبێت..

*کەهاوڕێکانی گەیشتن، سەرەتا ویستیان ڕێگای چوونە ژورەوەیان نەدەن.. وتیان درەنگ هاتوون‌و کات نەماوە، ئەمانیش زۆریان لەگەڵ وتن‌و زۆر پاڕانەوە کەلەدوابینینی هاوڕێکەی خۆیانیان نەکەن.. ڕازی بوون بەو مەرجەی لەژوورەوە هێمن بن و هوتاف نەکێشن..

هەر کەهاوڕێکانی بینی وەکو گوڵ گەشایەوە..

-دەك بەخێربێن، چاوو دڵم روون، بەراستی عەزێتتان كێشا..
ئەمان غەمگینو بێ رەنگ، ئەویش هەر كوڕەكەی جاران..
دوای كەمێ دانیشتن.. رووی كردە كاكە حەمەو هاورێكانی...
-قوربانتان بم، با بەیادی جارانەوە پێكەوە گۆرانییە خۆشەكەمان بلێینەوە..
ئەوەی وتو خۆی دایمەزراند:
-دەمەگری مەگری چاوانت دێشێ
دایكی خۆت نییە نازت بكێشێ
ئەوانیش بەقوڕگی پڕو چاوی پڕ لەفرمێسكەوە بۆیان سەندەوە..
ئینجا رووی كردە(ئاواز)ی هاوسەریو بەدەنگی بەرزتر وتی:
-دەمەگری مەگری چاوەكەت جوانە
هەرچەند تۆ دەگریت ماڵم وێرانە
لێپرسراوی ئەو بەشی لەسێدارەدانەی ئەكرەمی تیادا بوو، بەتوڕەیی قسەی كردو وتی:
-ئەمە چییە ئەكرەم، نەمان وت ئەم شتانە قەدەغەیە..
لەسەر خۆ وەلامی دایەوە :
_نا ..مەترسە، هوتاف وسروود وتن نییە، ئەمەئەو گۆرانییە خۆشەیە، كەلەگەڵ ئەم برادەرە عەزیزانەم دەچووینە سەیران دەمانووتەوە..
كابرا بەسەر سووڕمانەوە وتی:
تۆلەكوێو گۆرانیو سەیران لەكوێ...

کات گەیشتە ١٠ی شەو .. هۆڵەکە ڕەنگی مەرگی پێوە دیاربوو.. هەموو ماچیان کردو جێیان هێشت. بەتەنیا ئەکرەم و زەردەخەنەی سەر لێوو باوەڕی بەرزی و پەتی سێدارەکە مانەوە..

## یادگارە جوانەکان..

بەرلەوەی پەتیسێدارەی دوژمن ڕازەکانی نێو سنگی ئەکرەم شەهید کات، بەرلەوەی دەنگی وشەکانی کپ بێت، لەژووری زیندانەوەو لەسەر کاغەزی نێو پاکەتی جگەرەکانی، ئەو هەڵۆیە سێنامەی گەیاندەوە کوردستان، دوانیان بۆ ماڵەکەی خۆیو یەکێکیان بۆ نێو چیاکان..

لەیەکەمیاندا بۆ کاکی نوسیبوو:

(دەستو قاچی دایکمو باوکم ماچ ئەکەمو چاوی ئاواز ماچ ئەکەم، وائەزانم پێویست ناکات بڵێم ئاگات لەمنداڵەکانم بێت، چونکە ئەزانم وەکو ئەوانەی خۆتن لەلات ... خۆت ئەزانیت کە ئاواز منداڵە، لەبەرئەوە داواکارم ، ئەگەر خۆشی ڕازی نەبێت هەر بەزۆر فەرزی بکەن بەسەریا کە شوو بکاتەوە، چونکە ئێمە کەلەژیانماندا تێکۆشاوین بۆ بەختیاری ئادەمیزاد بووە، نەك بۆ بەدبەختیو حەز ناکەم ئەو بمێنێتەوە بێ شووکردن..)•

بەڵام ئاوازی ئەڤینداری شەهید ژیانێکی هەڵبژارد کەسەرتاپای بۆ جووتە منداڵەکەیو بۆ بیروەرییەکانی ئەکرەمی هاوسەری شەهیدی بێت...

لەدووەمیاندا، بۆ منداڵەکانی نوسیبوو:(بۆهەردوو منداڵە خۆشەویستەکەم... ئەمشەو سەعات دوانزەی شەو دوا هەناسەمان لەگەڵ

دنیایـەك هیـواو ئاواتـا بەپـەتی سـێدارە ئەتاسـێت. منداڵـە نازدارەکانم، ئێستا من تەمەنم ٣٥ساڵەو نزیکـەی ٢٠ساڵە لـەریزی جولانـەوەی شۆرشـگێری‌دا تێکۆشـاوم‌و هـەرگیز درێخیـم نـەکردوە، درێخیـم نـەکردوە لەپێشکەشـکردنی خۆشەویسـترین‌و بـەنرخترین شـت کەئـەویش گیانمـە،

خۆشەویستەکانم، کەئەم نامەیە دەخوێننەوە کاتێکی زۆر بەسەر شەهید بوونی باوکتانا تێپەڕیوە، بێگومانم لەوەی کە بۆ ئێوەش مەجالێکی فراوانـی تێکۆشـان ئـەمێنێت، مـن هـەموو ئامـانجێکم ئـەوە بـوو کەبەشێوەیەکی واپەروەردەتان بکەم کەهەمیشە بەهۆشیارانە ئامادە بن بۆ تێکۆشانێکی سەخت لەپێناوی مەزنترین چین‌و راسترین بیرو باوەڕ، کەئەوانیش چینی کرێکارو بیروباوەڕی مارکسیزم- لینینزمە..

خۆشەویستی شتێکی‌پیرۆزەو پیرۆزترین خۆشەویستیش خۆشەویستی کتێبە ، بۆیە داواتان لێ ئەکەم کەیەکەمین یاری نازدارتان کتێب بێت، دوای ئەو شتی تر، ژیانێکی پڕلەتێکۆشانتان بۆ بەئاوات ئەخوازم).

*باوکتان - ئەکرەم١٠/١٢/١٩٨٠*

لەسێهەمیاندا بۆکاك مستەفا چاوڕەشی نووسیبوو:

(چاوەکەم.. مستۆ گیان.. سلاو..

ئەمشەو دواهەناسەمان ئەخنکێنن، وا تێ نەگەیت من دوور بووبم لەجولانەوەی نیشتمانی ، من هەموو گیانی خۆم لەپێناوی بیرو باوەڕو ڕێگای رزگاریدا بەخت کرد.. تۆش ئاگات لەخۆت بێت، چاوت لە منداڵەکان بێت، ئەگەر بۆت بکرێ دایکت بنێرە بۆ لای کاکە حەمەی* برات..).

★ ★ ★

لەموسڵ جەستەی بێ نازی شەهید ئەکرەمی حەپسە شوێن بزر کرا.. ئەویش یەکێکە لەهەزاران شەهیدی کورد کەتائێستا بێ گۆڕنو خۆشەویستانو هاوڕێیانو کەسوکاریان ڕێگای چوونەوە سەریان نازانن، تا هەمیشە گوڵی رەنگاو رەنگی کوێستانەکانی کوردستانیان لەسەر دانێن، بەلام ناو و یادو خەباتیان لەدڵو دەروونی هەمووواندا زیندووە.

١٩٩٩/٣/٢

---

★ کاکە حەمە لەشۆڕشی ئەیلولدا بەفسفۆر گیانی سووتاوەو دواتریش دەستێکی بڕاوەتەوە، دایکیشی(کەپووری شەهید ئەکرەمە) لەساڵی ١٩٨٧دا بەژەهری سالیوم شەهید بوو.

# بیرەوەریی ئەنفالکراوێک

مام حەسەن عەبدولڕەحمان مەحمود تەلانی، کەتەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵ دەبێ، ساڵی ١٩٨٨ بەرهەڵمەتی ئەنفالە بەدناوەکانی رژێم کەوتووەو دوای ئەشکەنجە بینینی چوار مانگ ئازادکراوە، بیرەوەریی ئەو رۆژگارە سەختەی خۆی بەم شێوەیە بۆ گێڕاینەوە:

رۆژی ٧-٥-١٩٨٨ کاتێ سوپای بەعسی داگیرکەر هێرشی هێنایە سەر ناوچەکەمان، ئێمە لەگوندەکەی خۆمان، لەگوندی (تەلان) ی ناوچەی سورداش ویستمان خۆمانو مەڕو ماڵاتەکەمان رزگار بکەین، بەڵام نەمانتوانیو کەوتینە ناویانەوە! بەپیاوو ژنو منداڵەوە (١٠٠) کەسێك دەبووین، گیراینو هەموومانیان هێنایە ئەمنی (طواری) سلێمانی، دوو شەو لەوێ ماینەوەو پاشان سواری چەند پاسێکیان کردین و بردیانین بۆ تۆبزاوای کەرکوك، شەوێك ماینەوەو لەوێ پیاوە پیرەکانیان لەگەنجو ژنو منداڵەکان جیاکردەوە.. من لەخێزانەکەی خۆم دوو کوڕم لەگەڵدا گیرابوون کەناویان ئەوڕەحمانو عوسمان بوو، ژنو منداڵەکانی ترم پێشتر لەتەلانەوە دەرچوونو گەیشتبوونە سووسێ، بۆ رۆژێ دوایی ئێمە (واتە پیرەکان) کە(٢٠) کەس دەبووین سواری ئوتومبێل کراینو لەگەڵ ژمارەیەکیتر لەکوردی ناوچەکانیتر براین بۆ نوگرە سەلمان، ئیتر لەوکاتەوە نازانم چارەنووسی هەردوو کوڕەکەمو ژمارەیەك لەخزمەکانم چییەو هەموو ساتێ چاوەڕێی هەواڵێکیانم!

لەنوگرە سەلمانی دوابڕاو چوار مانگی رەبەق ماینەوە، لەوێ خرابووینە چەند قاوشێکەوە، ئەوەی ئێمە زیاد لە(٨٠) کەسی تیابوو کەهەموومان بەتەمەن بووین، بەڕۆژ دەبراینە حەوشێکەوەو ئێواران دەخراینەوە بەندیخانەکەوە، سەرەتا تاماوەی (١٥) رۆژ نانو چێشتیان دەداینیو ئەو کاتە مانگی رەمەزان بوو، بەلام دواتر رۆژی دوو سەموونە رەقیان دەداینێ لەگەڵ کەمێك ئاوی گەرم، رۆژانە لەقاوشەکاندا دوو سێ کەس دەمردن، هەریەکێ کەگیانی دەسپاردو شەهید دەبوو، دەمان هێنایە دەرێو پۆلیسێکیان لەگەڵ دەناردینو بەشەش کەس لاشەکەیمان دەبردە دەشتەکەو لەوێ دەمانناشت..

ئافرەتو منداڵیش لەقاوشەکانی دیکەوە حاڵیان هەروەکو ئێمەبوو.. لەو ماوەیەدا زۆرجار ئازاریان دەداینو قسەی سووکیان پێدەوتین، یەکێ لەپیاوکوژەکان کەزۆر خراپو بێبەزەیی بوو لەگەڵماندا خوێنمژێ بوو بەناوی (حەجاج)، لەوێ هەمیشە دڵ پڕ لەخەمو چاو بەگریان بووم بۆ ئەو کوردە دیلانە کەژمارەمان لە(٣٥٠٠) کەس زیاتر بوو، شەوو رۆژیش بیرو لێکدانەوەم لای دوو جگەر گۆشەکەم بوو. لەتاو ئەوان خۆمی بێدەسەلاتم لەبیرنەمابوو.. دوای چوار مانگ سەر لەبەیانییەك پیرو پەککەوتەکانیان جیاکردەوەو سوار ئوتومبێلێك کراین.. بەدوو رۆژ هێنایانینەوە بۆ سلێمانیو لێرە بەرەڵلا کراین.

بەلام، داخەکەم لەوکاتەوە تائێستا بەهیچ جۆرێ سۆراغی ئەو کوردانە نازانم کەلەنوگرەی بەعسییان لەگەڵماندا گیرابوون.. هەروەها خزمەکانی دیکەشمو دوو کوڕەکەشم هەربێسەرو شوێنن.

ژمارە ١٧٥، ١٩٩٢/٨/٢٦

# دایک و ژنی ئومێدو ئومێدەکانیان

لەسەرەتای ئەم پایزەدا، کەرۆژگار کورت دەبێت، دوو خانمی بەرگ رەش‌و چاو پڕ لەئەسرین بەسەرهاتی دوورودرێژی ژیانی رابردووی پڕ لەخەم‌و ئازاریان دەگێڕایەوە، باسی گەورەترین کۆستیان دەکرد، کەبێ سەرو شوێن بوونی ئومێدی ژیانیان بوو .. (ئومێد)ی کوڕە لاوی ماڵ‌و گوندیان..

* دایکە مەنیجە محەمەد ئەحمەد، تەمەن ٦١ ساڵی پڕ لەمەرگەسات، بەئەسڵ خەڵکی کریچنەیەو ساڵی شووی ١٩٨٨ لەئەنفالدا ماڵی لەئەستیلی سەروو بووە لەناوچەی قەرەداغ.. خاتوو مەنیجە دایکی رۆڵەی ئەنفالکراو کاکە ئومێد زەیدان حەسەنە کەپێشمەرگەیەکی هەڵکەوتووی تیپی (٥٥)ی قەرەداغی ی.ن.ك بووە.

ئەم ژنە جەرگ سووتاوە وتی:

- لەسەرەتای مانگی نیسانی ١٩٨٨ دا کاتێ زانیمان هێرشی ئەنفالە، من‌و ئومێدو ژنەکەی‌و کوڕەکەی لەئەستیلەوە بەرەو (گوڵەجۆ)ی گەرمیان هەڵاتین، لەوکاتەدا ئومێد بەمۆڵەت هاتبووەوە سەردانمان، بەڵام هەر چوارمان لەرێ گیراین، ئەوەبوو بەرەو قۆرەتوو براین‌و لەوێ دوو رۆژ

ماینەوە، ئیتر گوازراینـەوە بۆ تۆبـزاواو تـاوەکو ٤/٩ لـەوێ هێشتیانینەوە، ئیـتر ئێمـەیان لـەپیاوەکان جیـاکردەوەو بردیانینـــە حەویجــەو دبــس، نــەمانزانی کورەکــەی ئێمــەو پیاوەکــان بــەرەو کــوێ بــران، بــەڵام هــەر لـەتۆبزاوە جـلو بەرگـەکانیان بیـنران کـەهێندەی بــەرزیی خانوویــەك کەڵەکە کرابوون! بۆماوەی شـەش مـانگ لـەدبس ماینـــەوە و ژیـانی پـڕ لەئەشکەنجەو ئازارمان بەسەر برد.. هەمووومان ١٢ هەزار کەسێ دەبووین، لەحەویجەو دبس هـەزار کەسێك لــەمنداڵو ژنو پـیرەژن شـەهیدبوون، لەمانگی (١٠)دا بەربووینو لەچەمچەماڵ فرێیان داین.

★ داخوازیت لەحکومەتی هەرێم چیـیە؟

-هەرئەوەیە کەئاگاداری ئێمەی کەسوکاری ئەنفالکراوو هەژاربێ.

★ ★ ★

دوای پوورەمەنیج خێزانەکەی‌شەهید ئومێد بەهەناسەی گەرمو رەنگی زەردەوە کەوتە هەڵرشتنی رازەکانی، خوشکە بەستە مستەفای تەمەن (٢٣) ساڵ، وتی:

- لەژیانی خۆمدا خۆشیم نەدیوە، لەسەر بێشکەبووم دایکم وەفاتی کردووەو باوەژن بەخێوی کردووم، (ئاری) کورم یەك ساڵان بوو کەباوکی ئەنفالکرا.. ئومێد بۆمن تەنیا مێردنەبوو، بەڵکو ئومێدی گەورەی ژیانم بوو.

⋆ ئەی بەرێزت داواکاریت چی‌یە؟

- بەهیوام حکومەتو حزبەکان هەر سەرکەوتووبن، بەلاّم پێویستە کەسوکاری شەهیدانو ئەنفالکراویان لەبیرنەچێو نازی رۆڵە بێباوکەکان راگرن، بەڵێ دەبێ خەڵکی وەکو ئێمەمانانیان لەیاد نەچێ.

- دەبێ خۆزگەی گەورەی بەستە خان چی بێت؟

- گەورەکردنی ئاریو بوونی بەرۆڵەیەکی وەك باوکە بوێرو بەوەفاکەی، رۆڵەیەك لەداهاتوودا خزمەتی یەکێتیو گەلەکەمان بکات.

١٩٩٣/١٠/١٨

# دیداری ئەوانەی ئەنفال ئازیزترین کەسی لێ سەندوون

- خوشکە گەردە: سێ شەوە خەو بەمێردەکەمەوە دەبینم!
- گوڵەباخ: هەشـت مـانگ دوای گرتنـی مێردەکـەم، کچـە بچکۆلەکەم لەدایك بوو..

بەتەمە ن گەنجو بەساڵانی ژیانی رۆژگاری پڕ لەتاڵیو خەمو گریان، گەورەتر دەنوێنن.. دووان لەو خانمە دڵ شکاوانەی ئەنفالی بەدناوی رژێم مێردەکانیانی لێ سەندوون، ئەوانەی لەم سەردەمە پڕ لەگرفتو برسێتییەدا بوونەتە (باوکی منداڵەکانیشیان)و بەهەزارو یەك حەسرەتو دەردەوە رازی خۆیان بۆ هەڵڕشتین..

* خوشکە گەردە کاکی ئەحمەد، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦١، ژنی ئەنفالکراو کاك عەبدوڵلا مەحمود عەزیز، خەڵکی گوندی ژاڵەی ناوچەی سەنگاو، دایکی سێ منداڵی بێبەش لەنازی باوكو لەپارووی گەرم، بەسەرهاتی شوێن بزربوونی باوکی مناڵەکانی گێڕایەوەو وتی:

- رۆژی ١٩٨٨/٥/٢٠ (عەبدوڵلا)، ئەو کاتەی سەربازی هەڵاتوو بوو، بەپیلانی خۆ فرۆشێك لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەسگیرکراو ئیتر بێهەواڵ مایەوەو ئێمەش نەماندەوێرا لەو خۆفرۆشە سۆراخی بکەین، نەك خۆشمان بەگرت بدات، مێردەکەی من لەگەڵ حەوت خزمی خۆیدا گیرانو تێکەڵ بەئەنفالکراوەکان کرانو لەو کاتەوە بێسەرو شوێنن.

* لات وایە مێردەکەت لەژیاندا مابێت؟

- بڵێم چی، جاری وا هەیە بەدڵماندا دێو دەڵێین نەماوە، جاری وایش هەیە دەڵێین چونکە بێگوناهن خوا پاراستوونی، ئەمە بۆ سێ شەویش دەچێت تا بەیانی خەوی پێوە دەبینمو لەخەومدا دێتەوە..

* منداڵەکانت تەمەنیان چەندە؟

- (هەردی) نۆ ساڵەو (لەنجە) حەوتو (ئاری) کەبچکۆلەکەیانە شەش ساڵەو ئەمساڵ خراوەتە قوتابخانە.

- گوزەرانتان چۆنەو خەرجی منداڵەکانت بەچی دابین دەکەیت؟

- بەخێری کەسوکارو خەڵکی دەژین، هەر چۆنێ بێ بەیانیان سەرو چارەکە دینارێك دەنێمە دەستیانەوەو دەڵێم با لەقوتابخانە سەیری دەستی منداڵان نەکەن..

- دەتەوێ چیتر بڵێیت؟

- هەرچەندە برسیو موحتاجین، بەلام ئەم رۆژگاری ئازادییە کەم نییە بۆ میللەتەکەمان، خواو پێغەمبەر دڵسۆزانی میللەتەکەمان بپارێزێ، داوامان لەحکومەتی خۆمان ئەوەیە شوێنێکمان بۆ عیلاج بکەن تا تیایدا بژینو سەرمان کز بکەین، چونکە ئێمەی لێقەوماو گەنجینو ناتوانین هێندەماڵەو ماڵ بکەین!

* * *

خوشکە گوڵەباخ رەشید حسێن، تەمەنی ٣١ ساڵە و ژنی ئەنفالکراو هاشم محەمەد کەریم بووە کەخەڵکی گوندی (خاوێ)ی ناوچەی قەرەداغە..

خوشکە گوڵەباخ وتی:

- دایکی چوار منداڵم، گەورەکەم یانزە ساڵەو لەپۆلی سێیەمەو، بچکۆلەکەشم ساڵی ١٩٨٨ هەشت مانگ دوای گرتنی باوکی لەدایك بوو..

* کاك هاشم چۆن گیرا؟

- خۆمان ماڵمان لەسلێمانی بوو، لەمانگی چواری ١٩٨٨دا کاتێ قەرەداغ چۆڵ کرا مێردەکەم چوو بۆ لای براکەی کەلە(چیاسەوز) پێشمەرگەبوو، کەهەڵمەتی ئەنفال دەستی پێکرد بۆ رزگاربوونی خۆیان بەرەو سلێمانی لەگەڵ خاڵۆزایەکیاندا گەڕانەوە، بەلام لەبەردەقارەمان سەربازانی رژێمو جاش دەستگیریان کردنو دوای هەفتەیەك بیستمان لەچەمچەماڵنو دوای ماوەیەکیتر هێنرانە (طوارێ)ی سلێمانیو بەرێکەوت بینران، ئیتر برابوون بۆ تۆبزاوا، وەك دەڵێن لەوێوە بەئوتومبێل رەوانەکراونو ئیتر لەوکاتەوە بێ سەرو شوێنن.

● باری گوەزەرانتان چۆنە؟

- کرێگرتەمو هەندێجار لەلایەن کۆمیتەی (۱)ی رێکخستی سلێمانی (ی.ن.ك) یارمەتی دەدرێین، بەڵام یارمەتییەکیەی ئێمە لەهی کەسوکاری شەهیدان کەمترەو هیوامان وایە وەك یەکی لێ بێت، چونکە خۆتان دەزانن چەندە مەسرەف قورس‌و گرانە.

⋆ ئەی خێرەو مەندان‌و خزمان یارمەتیتان نادەن؟

- جار جارە بەڵێ، بەڵام چونکە هەژارو لێ قەوماو زۆرن ئەوانیش فریا ناکەون.. گەر کارگەیەك هەبێت ئامادەم کاری تێدا بکەم.

۱۹۹۳/۱۰/۳۱

# بەعس ئەو ژنەی ئەنفال کردم کەهەرگیز دڵی نەیەشاندبووم

زۆربەی ئەنفالکراوانی کورد پیاوان بوون‌و بەنەمانیان کۆستی گرانی دایک‌و ژن‌و خوشک‌و منداڵیان کەوتووەو لەگەڵ هەموو یادگاریکداو لەگشت خۆشی‌و ناخۆشییەکدا فرمێسکی بەخوڕ لەچاویان دەڕژێت.. بەڵام جاری واش بووە دەستە شوومەکانی بەعسی داگیرکەر پەلی ژنانی کوردیان گرتووەو بەرەو دۆزەخی ئەنفال راپێچیان کردوون‌و ژیانی تەنیایی‌و منداڵی بێناز بۆپیاوەکانیان بەجێماوە..

★ یەکێك لەو نموونانە کاك تاهیر حەمە غەریبە کەخەڵکی گوندی (خاوێ)ی سەر بەناحیەی قەرەداغە، جاران فەللاح بووەو ئێستا لەشاردا بەکرێکاری دەژی، ژنەکەی کاك تایەر ناوی (لیمۆ عەبدولکەریم)ە، کەرۆژی ١٩٨٨/٤/٦ لەتەمەنی ٢٢ ساڵیدا ئەنفال کراوە.. دوای خۆی سێ کوڕی ژیرو جوانی بۆ گەلەکەی بەجێهێشتووە، ئەوانیش (شیروان‌و نەهرۆو بڕیار)ن.

(ئەوکاتەی خوشکە لیمۆ دەستگیرکراوە، تەمەنی بڕیار دوو مانگ‌و چەند رۆژێك بووە..)

★ کاك تایەر بەڕوویەکی خەماوی‌و هەناسەی ساردەوە کەوتە قسەو وتی:

- لەو ڕۆژەدا من لەسلێمانی بووم، منداڵەکانیش لای خۆم بوون، لیمۆو کۆمەڵێ لەخەڵکی گوندەکەمان چوونەتەوە خاوێ تاوەکو کەلوپەلی ناوماڵ بهێنن، بەڵام لەوێ بەرهەڵمەتی هێزەکانی ڕژێم کەوتن‌و دەستگیرکران.. ئیتر هێنرانە (طواری)ی سلێمانی‌و دوای ١٢ ڕۆژ ڕەوانەکران‌و کەس نەیبینیونەتەوە.. کەئەوان‌و خەڵکێکی بێ دیفاعی زۆری دیکە لە(طواری) بوون، هەر چۆنێ بوو خۆم لەدیوارەکەی نزیك کردەوەو ڕێکەوت لەحەوشی ئەوێ چاوم پێی کەوت‌و ئەویش منی دی، لێم نزیك کەوتەوە، من زمانم لاڵ بوو و هیچم بۆ نەوترا، ئەویش دەگریاو وتی (دەڵێن بەرمان دەدەن، خەمتان نەبێ ئینشاڵڵا دێینەوە ناوتان).. سیخوڕەکانی ئەوێ هاواریان لەمن‌و چەند کەسێکی ئەو ناوە کردو بەجنێوی سووك راویان نایـن.. ئەوە دوا بینینی (لیمۆ) بوو، ڕۆیشت‌و کۆڵێ خەم‌و حەسرەتی بۆ بەجێ هێشتم..

★ پەیوەندیتان چۆن بوو، ناخۆشی دەکەوتە نێوانتان؟

- نەبەو خوایە هەرگیز ئەمە ڕووینەداوە، یەکترمان زۆر خۆشدەویست، هەر لەساڵی هەشتاوە کەخواستم تا لەیەك دابڕانمان هەرگیز دڵی نەیەشاندووم..

★ ئەی کوڕەکان باسی دایکیان ناکەن؟

- با، شیروان‌و نەهرۆ گەلێ جار باسی دەکەن، بەتایبەت شیروان، چونکە ئەو بەباشی دایکی لەبیرە..

* چی بەبکوژانی ژنەکەت دەڵێیت؟

- هەرچییەکیان پێ بڵێم پارسەنگ نییە بەخوێنی (لیمۆ)و هەموو بێ تاوانەکانی تر، هیوام وایە هەرچۆن لەکوردستاندا تەختیان تێك و پێك دراو لاشەیان بەسەریەکدا کەوت، لەبەغداو کۆشکی سەدامدا بەهەمان مەرە بگەن.. تەنیا بەوە بەختەوەرم لەراپەڕیندا بەم دەستانەم تۆڵەی ژنەکەمم لەئەمنە سوورەکە لەجەللادەکان سەند.

* دواجار کاك تایەر وتی:

- داواکارم حکومەتی هەرێم ئاوڕی لەکەسوکاری ئەنفالکراوان بداتەوەو خەمێکیان بخوات، من لە(ناسنامەیەك) بەولاوە هیچ یارمەتیەکم بۆ سێ کوڕە دایك ئەنفالکراوەکەم وەرنەگرتووە.

١٩٩٤/٢/١٦

## دایە نایلەی خاوەن (٩) شەهید:

# خاوەنی ماڵ و نان و ژیانی خۆم بووم و ئێستا بەسواڵ دەژیم..!

نایلە محەمــەد رەسوڵ، یـان دایـە نایلـەی چـەند جـار جـەرگ سووتاو، بەتـەنیا دیمـەنی سیماو پرچـە سـپییەکەیو بەرگەکەی پێناسـەبوون بــۆ تراژیدیــای ژیــانو مەرگەســاتی خێزانەکـــەی، خـــەریکی دەرهێنـــانی بەڵگەنامەی رەسمی بوو بۆ دووبارە بەشەهید ناونووسکردنی کـوڕو کـچو بووكو کوڕەزاو کچەزاکانی.. ئەم دایکە ٦٢ ساڵەیە ئێستا بەلێقەوماوی بـۆ ژیانی پڕ لەتاڵی و خزمەتی مێردە پەك کەوتووەکەی دەژی..

* دایەگیان، شەهیدەکانتان چەند کەسن، کۆستت بۆ چەند کەوتووە؟

- لەکیمیاوی بارانی گوندەکەمان (سێوسێنان)ی لای قەرەداغ بـەجارێك ئەمانەم مردن:

١. فەریقی کوڕم، تەمەنی ٣١ ساڵ بوو
٢. خەدیجەی ژنی، ٢٦ ساڵ
٣. ئاسۆی کوڕیان، ٦ ساڵان
٤. ئاشنای کچیان، ٥ ساڵان
٥. تەنیای کچم، کەتەمەنی ١٣ ساڵ بوو

هەرهەموویان پێکەوە شەهید بوون، دوای ئـەوانیش تـەنیا بـە(٣) رۆژ لەئەنفالەکەی رژێمدا ئەمانەم شوێن بزرکران و کەس نەیدۆزینەوە:

١. مریەمی کچم
٢. حەمیدی مێردی

٣. عەتای کوڕیان کە (٧) ساڵان بوو
٤. ڕێزانی کچیان کەئەویش ٥ ساڵان بوو
⋆ ئێستا لەکوێو لەگەڵ کێدا دەژیت؟
- لەگەڕەکی حاجیاوای سلێمانی لەهۆدەیەکدا لەگەڵ مێردە نەخۆشەکەمو کچێکی فەریقی کوڕمدا دەژیم کەدەرچووە بۆ پێنجەمی سەرەتایی.

• بەچی دەژین؟
- بەخێری خێرەومەندو موسڵمانان، یەکجاریش شەهیدانەی کوڕەکەمم وەرگرتووە، حاڵمان پەرێشانو خراپە! لەمەڵبەندی یەکی یەکێتی داوای بەڵگەنامەی مامەڵەیان کردووەو وا بۆیانی دەبەم، بەو هیوایەی فریامان کەون.

• لەکیمیابارانی ناوچەکەتاندا تۆ بەرنەکەوتی؟
- با بەرکەوتم، ڕێکەوت لەگەڵ هەندێ خزمو قەومەکەماندا بەتراکتۆر گەیەنرامە سلێمانیو دوای ئەوەی (٢٥) ڕۆژ لەماڵە خزمێ دکتۆر چارەسەری کردم، ئینجا هۆشم هاتەوە، هەرچی گیانم هەیە بووبووە پەڵەو چاوەکانم دەرپۆقیبوون، هیچ قسەم بۆ نەدەکرا، دەرزی زۆریان لێدام تا چاك بوومەوە، بەڵام دڵو دەروونم وەك ساڵی ١٩٨٨ هەرماتو کەیلە.

⋆ هیچ یەك لەشەهیدەکان دێنە خەوت؟
- تەنیا فەریق گیان هاتووەتە خەوم، پێی وتم دایکی خۆم، بەو بەرگە ڕەشەت ئازارم دەدەیت، کەپرسی مەلام کرد وتیان ڕاستە تۆ گوناهبار دەبیت، ئیتر گۆڕیم بەو نوقتە سپییە.

⋆ چی دەخوازی بۆ بکوژانی منداڵو ژنو مێردو نەوەکانیان؟
- دەخوازم سەدامو دارو دەستەکەی هەر سەرشۆڕبن، لەخودا داواکارم هەقم بستێنێ و بەدەردی منیان لێ بکات، کەلەماڵو باخی خۆمیان کردمو خستمیانە سواڵ، ڕەبی حاڵیان بەحاڵی من بێ.

★ جاران بەچی دەژیان؟

- بەحەیوان و باخ و ماڵی خۆمان، بەخوا رۆڵەگیان دوو خانوومان هەبوو، لەو گوندەدا سەلاجەو تەلەفزیۆنمان هەبوو، هەر هەمووی

تیاچوو، رۆڵە بەخوا زۆر هەژارین، کورەکەم، گەر موحتاجی نەبێ مرۆڤ هەرگیز دەست پان ناکاتەوە (ئەمەی وت و گریا..)

★ دایە گیان داواکاریت چییە؟

- داواکارم کاربەدەستان و حزبەکان واز لەهەموو شتێ بهێنن و ئەجری شەهیدان و گوندنشینان بدەنەوەو لەهەر کوێ سکێ برسی بوو تێری بکەن، لەهەر جێگایەك منداڵێك رووت بوو پۆشتەی بکەنەوە.

- بەهیواین.. دایەگیان بەهیواین!

١٩٩٤/١٠/٤

# ژانی ئاگادارییەک!

بەدرێژایی مانگی ئەیلوولی رابردوو، پاش ئەوەی لێپرسراوی بەشی ئاگادارییەکان، لەنوسینگەی سلێمانی ئەم رۆژنامەیە نەشتەرگەریی کردو لەسەر داوای لێپرسراوی نوسینگەکەمان کاروبارەکانی ئەویش بەمن سپێردرا، خوێندنەوەی چەند ئاگادارییەكو بیرکردنەوەی قووڵ، گەلێ بیرەوەرییان هێنایە پێش چاوم، ئەو ئاگادارییانەی لەدادگاکانەوە رادەگەیەنرێنو تایبەتن بەبەڕەسمی بەڕێوەبردنیکاروباری (ژن)ی ئەو کوردانەی لەئەنفالەکانو هەڵەبجەدا مێردە جوامێرەکانیان لەناو چوون، هەر هەموویان زامێکی قووڵ لەدڵدا جێدەهێڵن، تەنیا خوێندنەوەی ئەو جۆرە ئاگادارییە سەرچاوەیە بۆ گینگڵ خواردنو بینینەوەی (شریتی عومری رابردوو)، کەتیایدا رژێمی کوردکوژ دەیان هەزاری راپێچی مەرگ کردوە...

هەر لەو مانگەدا، ئاگادارییەك بەجارێ هەژاندمی، سەرەتا بەبینینی راچڵەکیم، ئەوجا لەگەڵ نووسینەوەیدا بەخۆمم زانی چاوەکانم بوو بوونە دوو گۆمی فرمێسكو کاغەزی بەردەمیان تەڕ دەکرد!

ئاگادارییەك کەلەکۆتایی ئەیلوولدا بڵاوکرایەوە، ژمارەی (٣٨٥)ی دادگای کاروباری کەسێتی سلێمانی دراوەتیو تیایدا هاتووە:

(هاوولاتی قادر جەلال مەحمود لەدایكبووی ساڵی ١٩٣٧ لەبەرواری (١٩٨٢/٢/٢٨)ەوە بزربووە، كاتی بزربوونی جلو بەرگی كوردی لەبەردابووەو كورتە بالابوو، نەزۆر قەڵەوو نەزۆر لاواز بوو، گەنم رەنگو قژی سەری رەش بوو، جا داواكارین هەركەسێك زانیارییەكی دەربارەی هەیە سەر لەم دادگایە بدات..)

دەمودەست بەقەڵەكەم نووسیم، بەڵێ جەنابی دادوەر من و هەموو هاوڕێكانی زانیاری تەواومان لایە.. هەموو كورد زانیاری بەكەڵكی لایە، بەڵێ قوربان، قادر جەلال (قادر كابان)ەو چاوسووورە نامەردەكانی دەزگا فاشییەكانی حكومەتی بەغدا گرتیانو شەهیدیان كرد، بەڵێ دڵنیاین لەشەهید بوونی، بەلام وەك هەزارانی تر رێگای چوونە سەر گۆڕی نازانین، كەسێ نازانێ لاشەی نازداری كراوە بەژێر كام چەند مەترە خۆڵی خاكەوە!

گەر لەكوردستاندا بوایەو گڵكۆی خۆی هەبوایە، ئەوا بە(جادە چۆڵو سێبەر)ەكاندا دەستە دەستە (شەمی شەوان)ی شارم بەبەرگی رەشو

(رووممـەتی وەك گوڵـی بێگـەرد)و بـەقژی ژاکاویانـەوە دەچوونـە سـەر گۆڕەکەیو بەدڵو بەکوڵ یادی بەخێریان دەکردەوە...

هونەرمـەندو شـەهید قـادر کابـان شـایەتی سـەدەیەکە، سـەدەیەکی پـڕ لەئازارو ژانی کوردی خێرنەدیو، قوربانیی دەستی رەشی ئەو دوژمنانەیـە کەبـەجارێ دەنگـە بەسـۆزەکەیان خنکانـدو شـیعرە جوانـەکانیان لەسـنگیا جوانەمەرگ کردو بەزۆر چاویان پێ لێك نا..

هەمیشە کەناوی قادر کابانی برای گەورەی دێ، یـان کـەگوێم لەدەنگـە ئەفسوناوییەکەی دەبێ، یەکسەر یادی ئەو ئێوارەیەی هۆڵی خولدی بەغدا دەکەمەوە کەبەر لە١٩ ساڵ لەپشتیەوە یـەکێ بـووم لەکۆرسـەکانی کابـانو تیپی مۆسیقای سلێمانیو لەگەڵ دەنگە بێوێنەکەی ئەودا دەمانوتەوە:

*بـــــــەجارێ مـــــــاڵی وێـــــــرانم*

*بەســـــەر چـــــوو وەعدەیـــــی ژینـــــم*

*بـــــــەناکامی لـــــــەدنیادا*

*بـــــەباچوو عومـــــری شـــــیرینم*

١٩٩٣/١٠/١٣

---

* ئەم وتارە لەچاو بڵاوکردنەوەی یەکەمجاریدا، هەندێ کورت کراوەتەوە..

# گۆشەی دڵ لەلای کێ بکەمەوە؟

من بووکە شۆخو شەنگەکەی پشدەر بووم، مایەی شانازی باوان و هۆزو گەلەکەم بووم، رەمزی سەرچاوەی جوانیی و بەرەکەت بووم، دەرودراوسێ دەیانناسیم و رێزیان لێ دەنام، هەمیشە دەستەخوشك و برا جوامێرەکانی مەهابادو گەرمیانم بەیەك چاو دەدی، هەردەم مەڵبەندەکەی من لەلایەن دوژمنانەوە دەپشکێندراو زۆرجاریش پێیان دەنا بەجەرگ و چاوەکانمدا..

لەمەرگەساتی ژیانی گەلەکەمدا بەهاری تەمەنم گۆڕرا بەخەزان، لە(حەفتاو چوار)دا ئەو کاتەی رژێمی داگیرکەر بۆمبارانی ماڵەکەی کردم، لای من جەستەی نازداری دەستەیەك لەشێرە کوڕانی سلێمانی دایکم و شارەکانی دیکە تێکەڵ بەخۆڵ و خوێن بوون..

ساڵ هات و چوو، کوێرەوەری زیاتر باڵی رەشی بەسەرماندا کێشا، لەسەنگەری بەرگری و زیندانەکانی بەعسدا کوڕەکانم و سەدان هەڵۆی بەجەرگی ناوچەکەم چاوی پڕ لەهیوایان پێ داخراو بەیەکجاری لەمن و گەلەکەم دوورکەوتنەوە، بەڵام بەڵێنی من و (بتوێن)ی خوشکم وەهابوو

**قەڵادزەی کاولکراو / ١٩٨٩**

لە کتێبی (کوردستان لە سێبەری مێژوودا)ی خاتوو سۆزان میسیلاس

بەجووتە پەیمان بەخۆمان بدەین لەگەڵ (فرمێسکی چاوا) تا ئازادی کورد نەبینین هەرگیز نەکەین (ماڵئاوا)..

(ئازادی)ی کوردستان هاتە دیی‌و بەر لەوەی ماڵەکەی من‌و ئەوانی دیکە ئاوەدان ببنەوە، بەر لەوەی گلکۆی شەهیدە بەجەرگەکانمان هەڵبەستین، بەر لەهەموو ئەوانە واجارێکی‌تر بۆمبای رق دابارییەوەو سەر لەنوێ پێ‌نرایەوە بەجەستەمداو شەهیدەکانیان شەهید کردمەوە، وا ئاسمانی ماڵەکەم رمێنرایەوە بەسەرمدا، وا گوللەی نامەرد چزایەوە بەگیانمداو خوێن جۆگەی بەستەوە، خودایە هێشتا گۆشەی دڵم نەکرایەوەو سوپای خەم هێرشی هێنایەوە سەرم، وا سەرلەنوێ شەهید کرامەوە، خودایە *..

١٩٩٤/٨/٨

---

* یەکەمجار بەناوی (قەڵادزێ)وە بڵاوکراوەتەوە

# ڕۆژێک لەخانەی مندالانی ئەنفال و گوێگرتن لەرازی بێ دایک و باوکان

ماوەیەك لەمەوبەر، ئەوكاتەی ڕێكـەوت ڕێگای نێـو شـوێنێكی یـەكجار پـیرۆزو ئـاوەدانی نیشـاندام، بێئــەوەی بــەخۆم بــزانم بــەجارێ خۆشــیو ناخۆشـی بوونـە میـوانم.. خۆشـیی ئـەوەی لەكوردسـتاندا خــەمی منداڵـە لێقەوماوەكان دەخورێو (گـەورەكان) هـەرچۆنێ بـێ هـەوڵی سـارێژكردنی كەمێ لەزامەكان دەدەن، كـە ئـەنفالی بـەدناوی بـەعس ناویـە بەجەسـتەی كـوردەوە، ناخۆشــی ئــەوەش، كــە منــاڵی پەپوولــە ئاســاو گوڵڕەنــگ بــۆ لەئێسـتاوە دوور لـەباوكو دوور لــەدایك بژیــن؟ ئەمــە بۆخــۆی خــەمی گەورەیــەو ئــەو خەمانــەش بــــەر لەهــەموو كــەس ئێخــەی نووســەرو هونەرمـەندی ئـەم گەلـە دەگـرن.. لـەو كاتـەوە دەمویسـت ڕۆژێ تـەرخان بكەم بۆ سەردانی ئەو منداڵە خۆشەویستانە، تـا لەنزیكـەوە (كوردسـتانی نـوێ) ببێتـە ئاشـنایانو لەخـەمو خۆشــیو خەونــەكانیان ئاگـادار بێـت، بیســتبووم بــەنیازن بەســەر پەرشــتی هونەرمــەند محەمــەد فــەتاح پیشانگایەك بكەنەوە، جێـی خـۆی بـوو لـەتابلۆو ڕەنـگو بابەتەكانیانـەوە

بیاندوێنین، بەڵام چاوەڕوانی گەلێ جار ناخۆشەو رۆژێکی دیاریکراو بەخزمەتیان گەیشتن..

## ئەو ژنە سویدییەی خاوەنی ئەم خانەیەیەو دایکی دووەمی منداڵەکانە..

لەمانگی مارتی ١٩٩٢دا، خانەی منداڵانی ئەنفالی کوردستان لەشاری سلێمانی لەدوو خانووی رێك‌و پێکدا کەلەناو جەرگەی شاردان (گەڕەکی ئاشتی‌و شەقامی فولکەی ئاشتی بۆیانەی ئەندازیاران) دامەزرا، یەکەمیان بۆ کوڕان (١٢ منداڵی تێدا دەژی)و دووەمیان بۆ کچان (١٦ منداڵی تێدا دەژی)، هەروەك لەقسەکانی مامۆستایان عومەر عوسمان ئیبراهیم (لێپرسراوی خانەکان)و (هۆگر موفتی) یاریدەدەر بۆمان دەرکەوت خاوەنی بیرۆکەو دامەزرێنەری ئەم دوو خانەیە مرۆڤێکی خێرخوازی منداڵ پەروەرو رۆشنبیرە کەلەهەندەرانەوە دڵی بۆکوردو جگەرگۆشە لێقەوماوەکانی دەسووتێ، ئەویش خانمی سویدی (دکتۆر هیلینا) یە لەمنداڵپارێزی خوارووی سوید، ئەو بەرێزە کەهەندێ لەمنداڵەکان بەدایکی دووەمی خۆیانی دەزانن بەئەرك‌و خەرجی خۆی ئەم خانەیە دەبات بەڕێوەو لەوەوبەر سەردانیئێرەی کردوەو وابڕیارە لەماوەیەکی نزیکی دیکەدا بێتەوە لای جگەر گۆشەکانی‌و ئەمانیش مژدەی سەرکەوتوویی خوێندن‌و هونەری شێوەکاری‌و خولی مۆسیقای پێبدەن‌و لەڕێوە بیبەنە ئەو ژوورەی گوڵی رەنگاو رەنگی وەك چاوو رەنگی خۆیانی لێ دروست دەکەن.

خاتوو هێلینا هەر لەسەرەتاوە بەڕێوەبردنو سەرپەرشتی ئەم خانەیەی سپاردوە بەکۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان (K.R.A)، ئەوانیش هەریەك لەمنداڵەکان بەرەمزی گوندێکی خاپوورکراوی گەرمیان دەبینن‌و دڵسۆزانە خزمەتیان دەکەن‌و چەند خوشك‌و برایەکی بەڕێز ڕۆژانە لەگەڵ ئەو ڕۆح سپییانەدا دەژین‌و سەرپەرشتییان دەکەن‌و وانەکانی ژیانیان پێ دەڵێن، لەوانەی ئێمە دیمانن بەڕێزان (ڕێزان خان، کاك زمناکۆ، ساراخان، کاك گۆڤار)بوون ، چەند کەسێکی دیکەش خواردنیان بۆدەکەن‌و جلوبەرگیان دەشۆن‌و خەمی گەورەو بچووکیان دەخۆن.. لێپرسراوی خانە فەرمووی : زۆرن ئەوانەی سەردانی ئێمەیان کردووە، بەڵام یەکجار کەمن ئەوانەی دەستی یارمەتی‌و هاندان بۆ ئەم منداڵانە درێژدەکەن، هەرگیز ڕۆڵی لەبەرچاوی (KRA) لەیادناکرێت.

ساراخانیش وتی: دیارە منداڵی کەسوکار ئەنفالکراوو شەهیدو لێقەوماو لەکوردستان‌و پارێزگای ئێمەدا یەکجار زۆرن، تۆ بڵێی کەسانی وەك د. هیلینا لەخاوەن تواناو خێرخوازەکانی ئێمە ڕانەپەڕن‌و خانەی لەم جۆرانە نەکەنەوە، تا لەژیاندا سەربەرزبن‌و دوای مردنیشیان نەوەکانی داهاتوو یادی بەخێریان بکەنەوە..

## لەگەڵ ئەو کوڕو کچانەی دوور لەنازی دایك‌و باوك گەورە دەبن..

بەر لەوەی لەگەڵ منداڵەکان دانیشین‌و بدوێین با ئامازە بۆئەوە بکەین کەتەمەنی کوڕەکان لەنێوان (٨ تا ١٦ ساڵ)ن‌و تەمەنی کچەکانیش

لەنێوان (٥ تا ١٤) ساڵدان و دوو کوڕی بچکۆڵەی تەمەن (٥) ساڵ و (٦) ساڵیش لای کچەکان دەژین.

## لای کوڕەکان ، پیاوانی دوارۆژ..

لەخانەی کوڕان، هەروەکو ئەوەی کچان، چەند ژوورێکی خاوێن، هۆڵو ژووری نانخواردن، ژوورەکانی نووستن، باخچەو کتێبو دەفتەرو کەرەستەی نیگارکێشان، جارجاریّ سەیران بۆناوچە جوانەکانی کوردستانی ئازاد، کوڕەکان هەموویان لەقوتابخانەنو خوێندکاری پۆلی دووەمی سەرەتایی، تا یەکی ناوەندین، خۆشبەختانە ئەمساڵ سیانیان بەپلەی یەکەم دەرچوون، یەکەم منداڵ کەبووە هاوڕێمان (سەربەست محەمەد مەدحەت) بوو

* کاکە سەربەست بچینە ژوورەکەی تر بەتەنیا دانیشین؟

- فەرموو بابچین..

سەربەست، تەمەن ١٦ ساڵ، خەڵکی گوندی گوڵباخی سەر بە قادر کەرەم، هێمنیو دەنگو هێماکانی ئەم کوڕە لەعومرێکی دوو شانزە ساڵی دەچوون..

* باوکت نەماوە یان دایکت؟

- هەردووکیان، باوکم رۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ لەقادر کەرەم گیراوەو ئەنفال کراو کەس نەیدیتەوە، دایکشیم (لەیلا عەزیز) لە١٩٩٠/١/١٦ لەحەویجە شەهید بوو.

* چۆن شەهید کرا؟

- ئەو بۆ بەخێوکردنی ئێمە هەموو رۆژیّ لەچەمچەماڵەوە (کەماڵمان لەویّبوو) دەگەیشتە حەویجە، بۆکارکردنو کرێکاری نێو کێڵگەکان، لەویّ بەکارەساتی ئوتومبێل وەفاتی کرد.

* زۆر راستە، دایکێك بۆ بژێوی هەتیوەکانی کاربکاتو بمری بێگومان شەهیدە، باشە ئێوە چەند منداڵن؟

- (٣) براو (٥) خوشك، دوو براکەی ترم لێرە لەگەڵ خۆم دەژینو خوشکەکانیشم لەخانەی کچان، من گەورەی هەموویانم، بەر لەوەی لەم دوو خانەیە وەربگیرێین لەچەمچەماڵ لەهۆدەیەکدا بەخێری خەڵکی دەژیاین.

* لەپۆلی چەندی؟

- بەیەکەم دەرچووم بۆ یەکەمی ناوەندی.

* ناوەکەتت لاخۆشە؟

- بەڵێ چونکە ماناکەی بەرزە.

* ئەی هەستی سەربەستێکی بێکەس چۆنە؟

- من لەئەسڵدا ناوم (ئادەم) بوو، بەلام چونکە لەگەڵ ماڵو کەسوکارەکەمدا دەفتەرنفووسەکەم سەری تیاچوو، کەلێرە بۆیان دەرهێنامەوە تکام کرد ناوم بنێن سەربەست.. بەلام (قورگی گیراو سەری داخست، فرمێسك پەرییە بەرچاوەکانی)

* ئێ کاکە گیان تەواوی کە..

- سەربەستێکی بێ دایكو باوکم، گەر لەنازی ئەوان بێبەش نەبوومایە ئێستا ژیانو ناوەکەم خۆشتر دەبوو..

* گەر خانەکانتان (خوانەخواستە) نەمێنێ، چۆن دوو براو پێنج خوشك دەژێنیت؟

- من هەموو خەمێکم ئەمەیەو رۆژانە بیری لێدەکەمەوە، هەرچەندە لای ئەمان لەهیچمان کەم نییە، بەڵام خۆمان بەمیوان دەزانین، ئاخر گوناحی ئەو خوشكو برایانەم چییە رژێم ئاواى لێکردین؟!

★ بۆ زۆربەی کات بێدەنگیت،سەرپەرشتیارانی ئێرە دەڵێن جاری وا هەیە هەست بەبوونیشت ناکەن، بۆ وادەکەیت؟

- من منداڵی ژیانێکی خەمبارم، حەزدەکەم تەنیابمو جار جارە هەر بەبێ دەنگی شیعریش دادەنێمو دەفتەرێ شیعرم هەیە، من کارەساتی وامدیوە هەرکە دێنەوە بیرم بەجارێ هەموو مێشکم داگیردەکەن.. ئیتر چۆن بێدەنگ نەبم!

• وەکو چی؟

- ساڵی ١٩٨٨ ئەوکاتەی لەگوندەکەی خۆمان خاوەنی ئەرزو ئاوو ژیانی خۆش بووین، دوژمن بەرەو قادر کەرەم راپێچی کردین، لەوێ باوکم لەگەڵ (٥٥) پیاویتر دەستگیرکرانو بەرەو خوارووی عێراق ئەنفالکرانو کەس نەیدینەوە، ئەو کاتەی پەلی باوکمیان رادەکێشا بانگی کردە منو دایکم و وتی: ئاگاداری منداڵەکان بن، خوا حافیزتان بێ.. ئیتر برانو سواری ئیڤا کرانو دواتر شەهید کران، لەوکاتەدا ١٠ ساڵ بووم، بەکوڵ بۆ باوکم دەگریام، ئێستاش لەبەرچاومە باوکی بەرێزم لەو دوا خواحافیزیەیدا دەستێ بەرگی کوردیی خاکی لەبەردابوو، جامانەکەشی بەسەرەوە بوو، کەڕایانکێشا جامانەکەی کرایەوە.. ئاخ (بەکوڵ گریاو منیش فرمێسکەکانی خۆمم سڕی)

★ ئێ، زیرەك گیان، وتت ئیتر باوکت نەدییەوە؟

- نەخێر، بەڵام کاتێ لەچەمچەماڵ بووین یەکجار هاتە خەونم‌و زۆر بەخەمباری‌و بێدەنگی دانیشتبوو، کەدەمدواند ئەو هەربێ دەنگ بوو، هەر ئەوجارە بینیمەوە.

⋆ ئەی دایکت؟

- کەباوکم ئەنفال کرا تەمەنی دایکم ٣٥ ساڵ بوو، لەکونەگورگێکدا دەژیاین، ئەو میهرەبانە دەیویست بەرەنجی شانی خۆی گەورەمان بکات، بۆنانی ئێمە دەگەیشتە حەویجە، بەڵام بەشەهیدبوونی بەجارێ هەتیو کەوتین.

- دوا دیمەنی دایکت چی بوو؟

- وەك زانیبێتی دەمرێ، شەوەکەی ئامۆژگاری منی دەکرد کەدەبێ ئاگام لەمنداڵەکان بێ، بەیانی زوو وەك هەموو بەیانییەکانی تر گورج‌و گۆڵ لەگەڵ رەفیقەکانیا بۆی دەرچوو، ئیتر نەماندییەوە.

⋆ دێتە خەوت؟

- بەڵێ زوو زوو دێت، دایکم ژنێکی زۆرجوان بوو، لەخەوەکانیشمدا هەر بەجوانی‌و میهرەبانی دەیبینم.

⋆ ئارەزووەکانی تۆ چین؟

- یەکەم خوێندن، دووەم شیعردانان، سێیەم وێنەکێشان.. (یەك لەنیگارەکانی داینێ کەوێنەی دایکە.. لەدەفتەرەکەشیدا سەرنجی شیعرەکانیم دا تیایاندابوو گەش‌و رووناك وەك پاشەڕۆژی خۆی‌و گەلەکەی، تیاشیاندابوو رەش‌و تاریك وەك رابردووی ژیانی خێزانەکەی) ئەمە چەند دێڕی پارچەیەکیانە:

وازم لێ بێنن با هەر تەنیا بم
وەکو دارەکەی سەرکەل وەها بم
وەکو ئەو دارە بێ پرزەو دەست بم
دایم ئاوارەو بێ خزم و کەس بم
بایەقوش بێتە سەرلق و پۆپم
لەجیاتی چرا بێتە گڵۆپم

★ ★ ★

دووەم منداڵ شەمال ئەحمەدی تەمەن (١٤)ساڵ بوو کەخەڵکی گوندی (قەیتول)ەو بەسێهەم دەرچووە بۆیەکی ناوەندیو لەم پشووەدا سەرقاڵی ئامێری ئۆکۆردیۆنە لەخولی مۆسیقا، باوکی کاکە شەماڵ بەکارەساتی ئوتومبێل سەری داناوەو دایکیشی شووی کردۆتەوەو دواتر مێردەکەی لەئەنفالدا شەهید کراوە.

شەماڵی زیرەك وتی:

- هەموو منداڵەکانم خۆشدەوێ، بەتایبەت سەربەستو سامان کەخزممن، خۆزیا خانەی تر بۆ منداڵی بێکەسی وەك ئێمە لەسلێمانیو هەولێر دەکرایەوە.

★ ★ ★

منداڵێکی ژیکەڵەی دیکە کەماوەیەکی زۆر لەگەڵیا دانیشتین کاکە ڕێبوار ئازاد حەمید بوو، تراژیدیای ژیانی خێزانە شەهیدەکەی ئازاد دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

- ساڵ ١٩٨٨ باوکە هەڵۆکەی ڕێبوار، دوای ئەوەی چەند ساڵێ بوو ژیانی ئارەق ڕشتنی کرێکاریی کەرکوك و گەڕەکی شۆریجەی جێهێشتبوو، لەپێدەشتەکانی گەرمیاندا پێشمەرگەی تیپە قارەمانەکەی (٥١) بووەو ، لەو ساڵەداو لەنەبەردییەکدا لەخالۆ بازیانی گوللە سنگی باوکەکەی ڕێبوارو هەردوو کیژۆڵە دڵخوازو چرۆ(کەلەخانەی کچان دەژیان) دەپێکێ‌و خوێنەکەی گوڵاڵەی ئەو ساڵە سوور دەکات، ئەو هەڵۆیەی گەرمیان دەگاتە ئاستی شەهادەت..

* ئەی دایکتان؟

- دایکم لە١٩٨٧دا واتە بەر لەشەهیدبوونی باوکم لەگوندی قەرەوەیسی سەردانی باوکم دەکات، کەلەوێ دەبێ بەر تۆپی دوژمن دەکەوێ‌و شەهید دەبێ.

* بەدیداری گۆڕەکانیان شادنەبوویت؟

- جەنازەی دایکم هێنرایەوە کەرکوك، ئێمە ئەویمان جێهێشت‌و نەچوومەتە سەر گۆڕەکەی، بەڵام باوکم لەناوچەی خاڵۆبازیانی نێژراوە، ئەو لەوێیە، یەکجار سەردانیم کردووە.

- کەی بوو؟

- سێ ساڵ لەمەوبەر، ئەوکاتە (١٠) ساڵ بووم (فرمێسك بەری چاوانی گرتو..) من و نەنکمو خوشکەکانم زۆر گریاین، بەو خوایە دووجار خۆڵی سەر گۆڕەکەیم ماچ کرد، وێنەی دایكو باوکی شەهیدمم لای خۆم پاراستووەو کەخوشکەکانم دەبینم نیشانیان دەدەم.

* لەپۆلی چەندیت؟

- بەپلەی باش دەرچووم بۆناوەندی..

**بێستوونی بچکۆلە شەترەنج دەزانێ ..**

منداڵێکی تری خانەی کوڕان بێستوون نەجمەدین، تەمەن ١١ ساڵو بەسێهەم دەرچووە بۆ پۆلی سێهەم، باوکی ساڵی ١٩٨٨ لەگوندی قەیتول ئەنفال کراوە، بێستوونی بچکۆلە وتی:

- من تەواو لەبیرم نییەو وەك خەو لەبەرچاومە، بەڵام دەڵێن باوکمو چەند کەسێکیتر خۆ دەدەنە دەست خۆفرۆشێك، ئەو ناپاکە دەیانداتە دەستی حکومەتو بردیانو کوژران. دایکم ئێستا لەچەمچەماڵ خزمەتی باپیرە نابیناکەم دەکات، لێرە خەوو خواردنم زۆر باشە، دادەکان زۆر بەڕێزنو هەموویانم خۆشدەوێ، ڕۆژانە سەرو یەك دینارمان دەدەنێو خەرجی دەکەین.

* حەز لەچ یارییەك دەکەیت؟

- لەتۆپ تۆپێنو شەترەنج، زۆرجار شەترەنج لەهاوڕێکانم دەبەمەوە.

* * *

## با ڕوو لەخانەی کچان بکەین..

خانەی کچان، پاك‌و خاوێن‌و بەدیمەن‌و پۆشتەو ڕۆشنە، لێرە دادە سارا سەرقاڵی خۆئامادەکردنە بۆ پیشانگاکەیان، هەروەها بۆدروستکردنی کتێبخانەیەك خۆماندوو دەکات ، یەکەم کیژی ئەم خانەیە کەئێمەی ناسی‌و قسەی بۆکردین خوشکە بێریڤان محەمەد مەدحەت بوو..

⋆ تەمەنت؟

- ١٤ ساڵ، خەڵکی گوڵباخی گەرمیانم، خوشکی کاك سەربەست‌و دوو برای تر لەکوڕان و ٤ کچی ئێرەم.

⋆ بەڵێ دەزانم ، بۆ چەند دەرچوویت؟

- بۆ پێنجەمی سەرەتایی.

⋆ چیت لەبیرماوە؟ ئەی ئێستا چۆن دەژیت؟

- بەر لەشەهیدبوونی باوکم واتە بەئەنفال کردنی، هەموو جار گوندەکەمان بۆمباران دەکرا، باوکم پێشتر پێشمەرگە بوو، دوایی جوتیاری دەکرد، سەربازو جاش بردیان‌و نەماندییەوە، ئێستا من گەورەی خوشکەکانم‌و برا بچووکەکانم ، بەڵام کاکە سەربەست گەورەی هەموومانە، لێپرسراوانی ئەم خانەیە دڵسۆزمانن‌و بوونەتە کاك‌و پووری ئێمە، سوپاسی د. هیلیناش دەکەم، بەڕاستی مرۆڤی دڵسۆزن.

- بیری دایکت زۆر دەکەیت؟

- ئەی چۆن، زۆر جار دێتە خەوم، هەموومان لەدەوری کۆدەبینەوەو ماچمان دەکات، بڕوام زۆرە پاشەڕۆژمان گەشتر بێت..

## خۆبەخشەکانی خانەکان

دواجار بەر لەماڵئاوایی خانەکان، دەمەوێ بەرێزەوە ناوی ئەو چوار مرۆڤە خۆبەخشە بنووسم کەمرۆڤایەتی وای لێ کردوون خزمەتی منداڵە بێنازە نازدارەکان بکەن، ئەوانیش :

١. کاك محەمەد فەتاح ، هونەرمەندی شێوەکاری ناسراو

٢. خاتوو رێزان عومەر، لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی

٣. دادە پەخشان ، مامۆستای ئایین و کۆمەڵایەتی

٤. دکتۆر عیماد ئەحمەدی پزیشك

لەکۆتاییدا سوپاس بۆ د. هیلینا، سوپاس بۆ رێکراوی (KRA)، سوپاس بۆ هەر دەستێکی پیرۆز دەستی بۆ خانەکان درێژ کردبێ، سوپاس بۆ تۆش خوێنەری هاورێ و ئازیزم

١٩٩٤/٩/٩

# لەدەستچوونی یادگارەکان

بەملی کەچو قورگی پڕ لەهەنسکەوە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو ..

- نا دەستە خوشکی منداڵیو گەورەییم، نا نەتزانی، تۆ چوزانیت لەو (هەولێر)ە من چیم لەدەستداوە، کەی من بۆ نوێنو ناو ماڵەکەم دەگریم، کەی شیوەنی من بۆ کتێبەکانی مێردەکەمەوە.. کەی سەرچاوەی فرمێسکەکانی من ئەوانەن.. کەی!

کوا من بۆ بیرەوەرییەکانم دەکوڵێم؟! شیوەنی من بۆ ئەو هەموو دیمەنەیە کەجارێکی دی نایانبینمەوە، بۆ ئەو چرکانەیە کەمنداڵی تۆماری دەکردن، بۆ ئەو ساتانەیە لەقوتابخانەو لەسەیران.. لەگەورەبوونو ماڵی خۆمانو ماڵی ئەوان، دەقاو دەق وەك خۆیان دەنەخشان، خەمی قورسم بۆ بەزمی نیشانەو زەماوەندمە، بارگرانیم بۆ

مانگی هەنگوینی و سەفەرەکانمە، زامی جەرگم بۆ ئەو یادگارانەیە لێم جیابوونەو، ئەو یادگارانەی لەگەڵیان دەژیام.. ئاخر خوشکێ (حەمە)کەی من گەورە بووەو بەمنداڵی نایبینمەوە، منداڵی ئەویشیان لێ سەندم!

* ئا.. مەبەستت وێنەکانتە ..

- بەڵێ خوشکێ مەبەستم لەئەلبوومی وێنەکانمە، ئەو ئەلبوومانەی هەموو ژیانمیان دەگێڕایەوە، ئەوانەی یادو یادگاریم بوون و نەمان، بەڵێ هاوڕێم بۆ وێنەکانم دەگریم.. بۆ یادگار.. بەڵێ خوشکێ بۆ ژیانم دەگریم..

١٩٩٧/٣/١٣

# نا..
# دایەگیان.. نا!

★ رۆڵە کەمم لەگەڵ نەکردی، تا بوویتە ئەم پیاوە رەنجی فەرهادم لەگەڵ دایت، بێوەفایی بەم پلەیە!

- نادایەگیان، گوێم لێبگرە، دایە من خۆشم نازانم چی دەکەم.. دایە (هەموو سەری پەنجەکانم لەگۆچوون)و خۆشم نازانم کارم چییە.. دایە ئاخر من خۆشمم لێ گۆڕاوە!

★ نا .. نا کوڕم، ئەی بۆ ناڵێی (ژن) دایکمی بیربردمەوە، بۆچی ڕاستو ڕەوان پێی لێ نانێی.. ئەی بۆ ناڵێی من سەردەمێ کوڕی تۆ بووم کەپێویستم پێت هەبوو، ئەو ساتانەی شیرم دەویست، ئەو کاتانەی بۆ گەرمبوونەوە دەتنووساندم بەسنگتەوە، ئەو شەوانەی تاکو بەیان لەسەر ڕانت بەلای لایە دەتخەواندم، ئەی بۆ ناڵێی ئەو کاتانە دایکم بووی کەسپێدە (چات) دەم دەکرد، ئەو بەیانیانەی قژە زەردەکەمت دادەهێناو جوانو خاوێن ڕەوانەی قوتابخانەت دەکردم.. ئەی بۆ ناڵێی؟!

- نا.. دایەگیان..

★ با کوڕەکەم، ئەی بۆ ناڵێی ئێستا گەورەمو منداڵ نیم، ئەی بۆ ناڵێی چ کارێکم بەپیرەژنە برسییەکەی دایکم ماوە، ئەی بۆ ناڵێی؟!

- نا دایکی من، بەو خودایە حەزدەکەم منداڵەکەم نانی هەبوایەو نیوەیم بۆ تۆ هێنابا..

کوا.. ڕاکردنی نێو بازاڕە نەگریسەکان دەهێڵن هەموو ڕۆژێ بێمە ماڵەکەتو لەتەوقی سەر تا بەری پێت ماچت بکەم!

ئاخر کەی برسییەک دەتوانێ برسییەکی تر تێر بکات، دەبا منو هەموو کوڕان بەر سکاڵای ئێوەو نەفرەتی ئەم ڕۆژگارە شوومە کەوین.. دەبا هەناسەی گەرمت بمسووتێنێو ڕزگارم بێ دایەگیان ..

١٩٩٧/٣/٢٧

# بۆکوێ ..
# براکەم، بۆ کوێ ؟!

دەڕۆیت ! چ قەدەرێکە پەلتان دەگریو بەرەو نادیارتان دەبات، چ سەردەمێکە برسێتی لەم ولاتە دەولەمەندەدا، دلتەنگی لەم نیشتمانە جوانەدا هەرِستی لەبەر بڕیونو بۆ نانو بۆ ژیان ئاوارەی کوچەو کۆلانو شەقامی ئەو شوێنانە دەبن کەنامۆن بەزمانو ناویان، بە دەروونو چاوانیان..

لەگەلَ تۆمە هاوڕێی خێر نەدیوم، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ دەزانم تۆ روبارێکیت لەخاوێنیو دەتناسم تۆ پەیکەرێکی وەفاداریتو لەناخدا داتاشراویت، بۆ کوێ.. ئەی نازانیت چۆن کەلەبەرێك دەخەیتە ئەو دیوارەی هێندە نابێ بۆ تەلاری ئاواتەکانی سبەی بەرزمانکردۆتەوە!

ئەی ناترسیت جارێکیتر خۆشەویستی بەنێوان هاوڕێیاندا گوزەر نەکات.. چۆن ناترسیت؟!

براکەم، دەزانم هیجرەتی عەقلەکانی ئەم گەلە شپرزەیەیە، دەزانم تۆش وەلامی (شەڕ) بەسەفەری خۆتو سەرە پڕ لەئێشەکەت دەدەیتەوە،

دەترسم.. زۆر دەترسم خـوا نـەکردە لـەو ڕێگای هـاتو نەهاتـە بـەردەمی گورگەکان کەویت، زۆر دەترسم.

خـۆ نـاتوانم لۆمـەت بکـەم، خـۆ ناشـزانم بـە چ زمانـێ بتـدوێنـم و لـەم خاکە پڕ لەزامەدا لەنگەرت پێ بگرم.

دەترسم خۆیشم سبەی ماڵئاوایی لەکۆڵانەکانی چوونـەوە بـۆ منداڵـیو شـەقامەکانی گەیشـتن بـەئایندە بکـەم، لۆمـەت ناکـەم، بـەڵام بەهـەموو سۆزمەوە بانگت دەکەم:

سـەفەر مەکـە، دڵـم دەڵـێ ناتبینمـەوە
فـێرە گریـانێکی سـەخت بـووم
دەسـتم پـێکرد ژیـر نابمـەوە.. *

١٩٩٧/٣/٢٠

*لەسەلاح محەمەدی شاعیرەوە

# گفتوگۆیەکی سەیر..!

بەر لەوەی (ژنـە) کڕیارەکـە بـەڕێ بکات، بـەدەم کێشانی شـتەکانەوە بەخاوەنی عەرەبانەکەی هاوڕێی وت:

- ئـەری وەڵڵا، گـەورەبوویتو خەریکـە شـەمەندەفەرەکە جێـت دێڵـێ، بیرێکی باشتری لێ بکەرەوە..

کەمێ لێی نزیك بۆوە، لەوەڵامدا وتی:

* ئاخر کاکە فەرەیدوون بەچی ژن بهێنم؟! بیبەمە کوێ؟!

بـەر لـەوەی شـەکرەکە بخاتـە نێـو کیسـەوەو بیداتـە دەسـتی ژنەکـە، بەبرادەرەکەی وت:

- چاوەکەم بیبەرە ماڵی خۆتان و ژوورێکت بەسە، ناوی خوای لێ بێنەو دەست بخەرە سەر کچێکی ڕێكو پێـك، خـەمت نـەبێ، خـودا یەکـەو قـاپی هەزار.

* جا کێ بەلەتە ژوورێك رازی دەبێ؟

ژنە بەشەرمەوە ڕوانییە کوڕەکەو بەدەنگێکی نزم وتی:

- با رازی دەبن، زۆرن بەو ژیانەی تۆ رازی دەبن، کوڕەکەم بەو خودایەی ئەمڕۆ نسیبی منی هێنایە ئێرە، کچەکەی من گەوهەرێکە بۆخۆی، دەوەرە بتدەمێ، دەوەرەو بزانە بەکلوری دنیای دەگۆڕیتەوە!

عەیبەی تیا نییە، بێوەژنم و بۆم بەخێو ناکرێن، خوا بەو سەرەوە ئاگادارە گەر یەکێك بەخێوی بکات دەیدەمێ، بەکراسی بەری خۆیەوە دەیدەمێ..

ئەوەی وت و فرمێسك بەسەر رومەتە زەردەکانیدا هاتنە خوار، هەردوو خاوەن عەرەبانە تەماشای یەکتریان دەکرد، ژنە رۆیشت و ئەوان هەر تەماشای یەکتریان دەکرد..!

١٩٩٧/٤/٣

# ژیله گیان، خەمی تۆش زۆر قورسه..!

لەپەنجەرەی بێ شووشەی قوتابخانە تێکەڵاوەکەی سەید سادقەوە سەرنجم چووە سەر منداڵێکی زۆر جوان.. قژی زەردو درێژ، جووتێ جزمەی کچانە، وەك دوو هاوڕێی دێرین بین، ئەویش بەچاو وەڵامی دەدایەوە.. دەستم بۆ هەڵبڕی و پێکەنی.. مۆڵەتم لەمامۆستا خواست و چوومە دەر.. لێی نزیك بوومەوەو رایکرد.

خۆی گرد بەحەوشە بێ دیوارەکەی بەرامبەر قوتابخانەدا.. شوێنی کەوە ..

★ ببورە خوشکم، دەمەوێ وێنەیەکی ئەو منداڵە جوانەت بگرمو بیدوێنم.

- بەسەر چاو.. با بۆتی بێنم.

(ئەو چووە ژوورو منداڵە گریا.. قابلەمە بچووکەکەی سەر ئاگرەکەم هەڵدایەوە، تەماتە بوو، تەماتە لەئاوی زۆردا ون بوو بوو..)، دایکی هاتەدەر

- بەخوا نایەت.. کچەکەی من قسە نازانێ!

★ بۆچی؟

- ئاخر کەڕو لاڵە.

★ وای لەم خەمە!

- براکەشی هەر وایە.

★ ئەی باوکیان؟

- نەخێر ئەو ساغە

★ نیشانی کەست نەداون؟

- بردمنە رێکخراوێك.. هیچ!

★ قسەمان نەما.. ژیلە حەزی لەهاوڕێیەتی من نەکردو بەجێم هێشت. بەخۆمم وت:

- داخۆ کەی بێ خەمی ئەم منداڵە بێ دەنگەو هەموو منداڵە قسەکەرە بێنازەکانی کوردستان بخورێت؟. کەی بێ؟! کەی..

١٩٩٦/١/٢٦

## سوپاس و پیزانین

- بەرامبەر هاوکاریی خۆشەویستانم ئیدریس شەیداهۆ، شادمان ئیسماعیل، بێگەرد عوسمان، فایەق حەمەساڵح و سارا محەمەد؛ سوپاسگوزارم و وێنەیان هەر زۆر بێت.
- ئەمەکدارم بەرامبەر یارمەتیدانی برایانی بەرێزم کاک کاروان و عەلی و مامۆستا سەباحی غالب بۆ چاپکردنی ئەم کتێبە، هەر سەرفرازبن.

نووسەر

مارتی ٢٠٠١

## یاسین قادر بەرزنجی

- ساڵی ١٩٥٦ لە سلێمانی لەدایك بووە .
- لە سەرەتای حەفتاکانەوە بەشداری بزوتنەوەی شانۆی کوردییەو وەك ئەکتەرو نووسەرو وەرگێڕ بەرهەمی کەوتووەتە بەرچاو .
- لەدوای راپەڕینەوە کاری رۆژنامەنووسی دەکاتو ئەندامی دەستەی نووسەرانی (کوردستانی نوێ) بووەو ئێستاش راوێژکاری رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان)ە .
- (١٠) کتێبو نامیلکەی چاپکراوی هەیە کە بریتین لە نووسینو وەرگێڕان لە بوارەکانی شانۆو رۆژنامەنووسیو چیرۆکی منداڵانو بیبلیۆگرافیا، چەند کتێبێکی تریشی ئامادەن بۆ چاپ .
- ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کوردو یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستانو بنکەی ئەدەبیی گەلاوێژو یەکێتیی رۆژنامەنووسانەو سەرۆکی تیپی شانۆی سالارە .
- بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتیی سلێمانییەو ساڵی ١٩٨١ خێزانی پێکەوە ناوەو باوکی (راستیو رەوەزو شانۆ)یە.

# پێڕست

## وتەیەك ..

ماوەیەكی هێندە دوورو درێژ لەنێو دەردی سەری ڕۆژنامەنووسی و ڕۆژنامەنووساندا نەژیاوم، تاهەزارویەك بیرەوەریی جۆراو جۆرم لەلا كەڵەكە بووبێ و لە هەر بۆنەیەكدا بخوازم لێی هەڵبژێرم.

من هەر هێندەی تەمەنی پێگەیشتنی ئەمامی قۆخێك لە باخی ئەواندا ماومەتەوەو ئەو ماوە كورتەش لە باخی پڕدارو دەوەن و دڕك و داڵی ئەوی، لە تەئەو تەنیسم و تەوری ئەوی، هێندێك بۆنی گوڵ و تامی خۆش و زامی بچكۆلەم لا ماوە.

هێشتا ئەو بەشەی وڵات نەببوو بە دوو، ئەوسا من لەگەڵ بەشێك لە برادەران لە هەولێرو كاك یاسین و بەشێك لە برادەرانی سلێمانی پێكەوە (كوردستانی نوێ)مان دەردەكرد.

لە هەولێر ڕۆژنامەنووسێكی هەست پاك و بیرتیژ هەبوو ناوی (غیاث الدین نەقشبەندی) بوو، یەكەمین جار لەو ڕۆژگارەدا چیرۆكە هەواڵی داهێنا. لە سلێمانیش (یاسین قادر بەرزنجی) ئەو جیهانە سەرسامەی هەڵبژاردو درێژەی پێداو هەردووكیان ڕەنگرێژی ئەو جۆرە نووسینەو ڕیپۆرتاژی تریان كرد كە لەڕۆژنامەدا گرنگی بە تراژیدیا دەدەن، بۆ دروستكردنی پەندو عیبرەتی كۆمەڵایەتی، یا لە كلاوڕۆژنەی ڕووداوە ڕاستەقینەكانەوە پرشنگی ئەندێشەو بەهای كۆمەڵایەتییان تێكەڵ كردو نووسینی خۆیان گەشە پێدا.

یاسین بەردەوامە، چەندین بەرهەمی دڵگیری نووسیوەو توانیویە لە ژیانی ڕۆژنامەنووسیی خۆیدا ڕێچكەیەك بۆ خۆی دارێژێ .. دڵنیام لە ئایندەدا زیاتر باوی ئەم بەرهەمانە دەبێ، بەتایبەتیش كە ڕۆژنامە ئازادترو سەربەخۆتر بوو.

دلشاد عەبدوڵا

١٠٠